١٩٨٢/٦/٥

# خۆشەویستیی ژیان

چیرۆک

دانەر : جاك لەندەن

وەرگێڕ : محەمەد بەدری




162 posts | 11.8k followers | 5 following

Promote | Edit profile

PDF پەڕەی فەرمی 📚 کتێبی
ublic Figure

لێرە
باشترین و بەسودترین و پڕ خوێنەرترین کتێبەکان
بە خۆڕایی و بە شێوەی PDF داگرە

Ganjyna

لینکی کتێبەکان 👇 ئەم لینکە بکەرەوە بۆ داگرتنی کتێبەک
ive.google.com/folderview?id=1gk8e3nSJGJLu36xeLUjwdbjgTSVsI
awraman, Slemani, As Sulaymaniyah, Iraq



Ktebi_PDF







چیرۆك

# خۆشەویستیی ژیان

نووسینی جاك لندن

وەرگێڕ محەمەد بەدری

---

چاپخانەی الحوادث

بەغدا – ١٩٨٤

ئەم نامیلکەیە بریتی‌یە لە سێ چیرۆکی درێژ کە لــە کۆمەڵــە چیرۆکەکەی چیرۆکنووسی ئەمەریکایی جاك لندن کە بەناوی ـ لەژێر ئاسمانی بەفریندا ـ بڵاوی کردوەتەوە هەڵمبژاردووە ..

جاك لندن لە شاری سان فرانسیسکۆ لـە ئەمریکادا لەدایك بووەو بە هەژاری‌و کوێرەوەری قۆناغی منداڵی بردوەتە ســەرو هەمیشە حەزی لەوە بووە بە بەلەمەکــەی بــە ناو دەریاکــاندا بــگەڕێ .

چووەتە زانکۆی کالیفۆرنیاو لە پاشان هەوڵی داوە بــە دوای زێڕدا بــگەڕێ‌و هەرێمو ناوچـــەیەکی یەکجــار زۆرێ بینیوەو لەئەنجامــــدا بـــە دەست بەتاڵی گـــەڕاوەتەوەو هیچــی دەست نەکەوتووە ..

هەرچەندە کە جاك لەندەن لەو سەفەرانەیدا بەدەست بەتاڵی گەڕاوەتەوە بەڵام توانیویەتی زۆر شتی پێویستو بەسود فێربێت‌و

بیت بە خاوەنی تاقیکردنەوەیەکی بوختو بەبەرهەمو ئەو سەفەرانەی بوونەتە کەرەستەیەکی بشەو سوود بەخش بۆ نووسینەکانی ..

ئەم سێ چیرۆکانەش نموونەیەکن لە چیرۆکە سەرکەوتووەکانی ئەم نووسەرە بلیمەتە ..

هیوام ئەوەیە لە بە کوردی کردنیاندا سەرکەوتوبم و ئاواتەخوازم کە خسوێنەری ئازیزیش لێم ببورێ گەر کەمو کورییەکی بە چاو کەوێ .

**– وەرگێر –**

هەردوو پیاوەکە لە نیوان تاشەبەردەکاندا بەرەو کەناری رووبارەکە کەوتبونە رێ ، ەوەندە هیلاكو شەکەت ببوون ئەتوت هەر ئیستاکە ئەبووڕێنەوەو مرۆڤیش بێ ئەنەکرا نیشانەی خۆڕاگرتنو سەبرکردن لەسەر دەمو چاویاندا بەدی بکات •

هەر یەکە بارێکی زۆر گرانو قورسی لە سەر پشتیدا هەلگرتبوو ، خواردنو نوینو هەندی شتی پێویست لەوانەی کە پیاوی گەڕیدە پێویستیی بێ دەبێ لەم جۆرە هەرێمانەدا ، سەرەرای ئەوەش تفەنگێك کە هەر یەکێك لێیان بە شتێکی پێویستی ئەزانی ••

بەرێوە ئەرۆشتنو چاویان بەرەو ئەرز شۆڕکردبوون ، جارێك ئەم پێش ئەکەوتو جارێ ئەو •• ماوەیەك کپو مات بوون •• کە گەیشتنە لێوی ئاوە بەستووەکە بەسەریا رۆیشتن • • ئاوەکە تا بلێی سارد بوو بۆیە ناچار بوون هەردوو پێیان بە شتێك بپێچنەوە ، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە هەر یەکە پێلاوێکی قورسو گرانی لە پێ‌ی‌دا بوو ••

ئەو پیاوەی کە بەدوی هاوڕێیەکەی‌دا ئەڕۆشت بەرێوە زۆر شەکەت ببووو بۆ چەند جارێك بوورایەوەو کەوتە ســـەر ئەرز ، کـەچی هاوڕێیەکەی هیچ جۆرە ئاورێکی لێ نەدایەوە .. ناچار بوو هاواری لێ بکات ..

ـ بێل .. هۆ بێل فریام‌کەوە قاچم شکا بێل ئاوڕێ نەدایەوەو لـە برینی رووبارەکە دا بەردەوام بوو بەبێ ئەوەی سەیری ئەم‌لاو ئەو لا بکات.. کابرای پەککەوتووش بۆی ئەڕوانی‌و بە تەمای ئەوە بوو بگەڕێتەوە بۆ لای ، ئەویش وردە وردە دوور ئەکەوتەوە ، بۆیە گەیشتە ئەو پەڕی ڕقو توڕەیی‌و واقی وڕماو چـاوی ســـوور هەڵگەڕاو دەمی کرایەوە ..

بۆ جارێـکی‌تر هاواری لێ کرد :

ـ بێل .. ئەرێ بێل ...

کەچی بێل هەر گوێشی پێ نەداو ئاوڕێ لێ نەدایەوە وەك هیچ گوێ لە هاوارەکەی نەبێ .

کابرای نائومێدیش بە چاوێکی خەفەتبارەوە بۆ هاوڕێیەکەی ڕوانی تا لەبەر چاوی‌دا ون بوو .

ئیتر وەك ئادەمیزادێـکی سەرســام بە تەنیا لەم هەرێمە دوورو بەرینـــەدا مایەوەو هێزی ئەوەی نەبوو بەرێوە بڕوات چۆنـــکە قاچێکی لەکار کەوتبوو .. سەیری سەعاتەکەی کرد کات سەعات

جوان بوو ، بەڵام نەیئەزانی ئـەم رۆژە چ رۆژێـکە ، لای وابوو یەکێکە لە رۆژە دوایی‌یەکانی مانـگی گـەلاوێژ یاخود سـەرەتای مانگی ئابە ، چونکە ئەمە زیاتر لە دوو حەفتەیە رۆژو شـەوی لە بیردا نەماوە .

وا هەستی کرد کـە ئەم شوێنە ئەوەندە دوور نی‌یە لـە دەریاچەی ورچە گەورەکە ، ئەمەی بە خەیاڵدا هات هەر چـەندە رۆژێ لە رۆژان نەهاتووەتە ئەم دەریاچەیە بەڵام ئەوەی لـە بیرە کە بە سواری پاپۆرەوە پێرەدا تێـەر بووە .

سەیری دەورو بەری خۆی کرد هیچ جۆرە دارو درەختێکی بەدی نەکرد ، ئەوەی دونیای شاردووەتەوە بەفرێکی سپی رەنگەو هیچی کـە ، هەستی بـە ترس‌و تەنیایی کرد بۆیە هاوارەکـەی تازەکردەوە :

ـ بێل .. بێل ..

هیچ جۆرە وەڵامێکی لە (بێل)ەوە بەر گوێ نەکەوت ، واتـە هاورێ‌یەکەی زۆر دورەو رۆشتووەو ئیتر گەڕانەوەی بۆ نی‌یە . ئەوەندە هیلاکو شەکەت بو هیچی بۆ نەمابوو لـە خـۆی بچێتەو بکەوێت .. هیلاکو خەفەتباربوو .. تفەنگەکەی لێ بەر بووە ناو رووبارەکەو ئاو بردی . هەوڵێکی زۆرێدا بۆ دۆزینەوەی گـەڕا بەدوایدا ، هەر ئەمەش بوو بە هۆی گەڕانەوەی ئەو تۆزە گۆرج‌و گۆڵی‌یەی . تفەنگەکـەی دایەشان‌و وردە وردە کـەوتە رێ ،

پشوودانی بۆ نەبوو ، جێ‌پێی هاوڕێیەکەی باشترین رابەری بوو بۆ رویشتن .. بە هەمان رێگەدا ڕۆیی تا گەیشتە ئەو بەرزاییەی کە بەسەر دۆڵە بەرینەکەدا شۆڕ ئەبێتەوە .. بە وریایی‌و کەمە کەمە گەیشتە ئەو دۆڵە ساماناکە ..

زەوییەکە سەرانسەر نوقمی ئاو بوو بوو . . سەرەرای ئەوەی کە هەنگاوێك ئەنا قاچی نۆقمی قوڕاوەکە ئەبوەوە کەچی هەر بەردەوام بوو لەوەی رێگەی هاورێیە راکردووەکەی بگرێ، چونکە جێ پێی ئەو هاورێیەی لە ناو قوڕاوەکەدا دیار بوون‌و وەك هەندێ دوورگە لە ناوەرا ستی ئوقیانووسێکدا وەدەر ئەکەوتن . هەر چەندە ئەم زەلامە لەم جیهانە پان‌و بەرینەدا بە تەنیایی مابووەوە بەڵام هەستی بە ون‌بوون نەئەکردو خۆشی لە راستی‌دا ون نەبوو بوو ، بڕوای بەوە بوو کە ئەمرۆ نەبێ سبەی ئەگاتە ئەو شوێنەی کە تیادا ئەمرێ ، واتە ئەگاتە ئەو رۆژەی کە مردن تیادا چاوەرێیەتی ، لەبەر ئەوەوە پێویستە خێرا بڕواتو ئەوەستێ بۆ ئەوەی بگاتە جێگەیەکی هێمن .. بۆ نموونە بگاتە ریفاردیزو چاوی بە بێلی هاورێی بکەوێ ، بێل کە ئێستاکە چاوەرێیەتی‌و لەوێشەوە بۆ دەریاچەی ورجە گەورەکە ئەکەونە رێی پاشان ڕو ئەکەنە باشوورەوەو بەرەو (ماکنزی)و لەوێشەوە بۆ یەکێك لەو بنکانەی کە کۆمپانیای - هدسۆن‌بای - دایانمەزراندووە ئەوەو لە ئەنجامیشدا ژیانێکی خۆش‌و خواردنێکی بەتام‌و لەزەتیان وەدەست ئەکەوێ .

بەو بەڕی هیلاکی‌و شەکەتی‌دا ڕێگەی ئەبڕی‌و ئەم شتانەش لەناو مێشکی‌دا ئەهاتن‌و ئەچوون .. ئەوەی سەیریشە قەت بڕوای بەوە نەبوو کـــە هاوڕێیەکەی بەجێی هێشتبێ ، مەزەنەی وابوو هەوڵی داوە پشکەوێ بۆ ئەوەی بگاتە ئەو شوێنەی کــە خوراك‌و زەخیرەی تێدایە بۆ هەردوکیان .. چۆن ئەبێ بێـل لەم هەرێمـە دوورەدا بە جێی بهێڵێ ؟ بێل گـــەر ڕاست بێ‌و جێی هێشتبێ مانای ئەوەیە ئیتر پێویستە واز لە ڕویشتن بهێنێ‌و چاوەڕوانی مردن بێ ، چونکە ئەوەی ڕاستی‌بێ بێ ناکرێ بە تەنیایی ئـــەم ڕێگەیە تەواو بـكات .

ئەم زەلامـــە ماوەی دوو ڕۆژ ئەبێ هیچی نەخواردووە .. تووشووەکەی کۆتایی پێ هاتەوەو ئیستاکە هیچ جۆرە خواردنێکی نی‌یە ، بە ناچاری پەنای بردە بەر هەندێ دڕك‌و گیا هەرچەندە کــە ئەشینرانی سوودیان نی‌یە بەڵام چ بــکا هیچ نەبێ تا ماوەیەك لـــە برسی‌یەتی دووری ئەخەنەوە ..

لە سەعات نۆدا پێی بەر یەکێك لە تاشەبەردەکانا کـــەوت‌و برینەکەی وای لێ کرد بکەوێتە سەر ئەرز .. تا چـەند دەقەیەك بەم شێوەیە مایەوەو لە پاشدا توانی بێتە سەر خۆی .. تاریکایی تـا ئەم کاتە دونیای نەپۆشیبووە ، هەندێ کۆتەڵە داری کۆکردەوەو ئاگری داگیرساند بە مەبەستی ئەوەی تۆزێ ناو گەرم کات .

شخاتەکەی هێنایە دەرەوەو دەستی بە ژماردنی دەنکەکانی کرد،

شەست‌و حەوت دەنك بوون •• سێ جاریان ژمارد ، پاشان بە سێ
سێ دایاننا ، هەر کۆمەڵێکی خستە شوێنێکی تایبەت • یەکێك لـــە
گیرفانی ، ئەوەی‌تر لە سنگی ، سێ‌یەم‌یان لە ناو کیسە توتنەکـــەی‌و
چوارەمیان لەناو کلاوەکەی‌دا • کە لەمە بووەوە دەنکەشخانەکـــانی
دەرکردو بە وردی‌و هێمنی دەستی بە ژماردنیان کردەوە، لەوە دڵنیا
بووەوە کە تەواون ••

پێڵاو گۆرەوی‌یەکانی وشك‌کردەوەو نوێنەکەی گەرم کرد بینی
قاچی ئاوساوەتەوە چاك بەستی‌یەوەو هـــەندێ ئاوی خواردەوەو
سەعاتەکەی پێچ‌دایەوەو بەتانی‌یەکەی بـــە خۆیەوەدا ، بەو پەری
هێمنی تا بەیانی خەوت •• بەیانی کاتی کە سپای روناکی تاریـــکی
شەوی ڕاو نابوو ، تەماشای سەعاتەکەی کرد کـــات شەشی بەیانی
بوو •• کاتی لەسەر پشتدا ڕاکیشابوو تەماشای تاریکایی ئاســمانی
ئەکرد هەستی بە برسی‌یەتی کرد ڕێخۆڵەکانی ئەنجن ئەنجن ئەکات
لەم کاتەدا کە ویستی ڕاست بێتەوە ئاوڕی دایەوە چاوی بە ئاسکێك
کەوت نزیکەی چەند مەترێك لێ نزیکە ، خێرا پارچـــە گۆشتێکی
برژاوی ئەو ئاسکەی هـــاتە بەر چاو ، خێرا دەستی دایە تفەنـــگە
بەتاڵەکەی‌و پەنجەی خستەکار بەڵام بێ سوود •• ئاسکە ڕای‌کردو
هیچمان لـــە هیچ •

پیاوەکە گەیشتە قینی‌و جنێو بارانی تفەنگەکەی کردو دایـــە
گرمەی قیژە قیژو هاوارکردن‌و هەستایە سەر پێی بەڵام ئای لـــە
ئازاری لاقە شکاوەکەی ! سەیری دەورو بەری خۆی کرد کـــەچی

شوێنەوارێــــکی زیانی بەدی نەکرد •• ئاسمانی تاڵو گــــران ••
هەتاوێـــکی شاراوەو جــــگە لــــە بەرد بەولاوە هیچی نەبینی • •
بەردەکان بەگشتی شــــاراوەی شەختەیەکی سپی رەنگ بوون ••
ئەوەی هاتە بەرچاو کە رێــگەی بزرکردوە واتە لێ ئاشکرا بووەوە
کــــە رێــگای ون کردووەو ئیتر بێ ناکرێ بزانێ لە چ شوێنێکەوە
هاتووە ئەمە لە کاتێکدا کە دڵنیا بوو کە هەر ئەکاتە مەنزڵ ••

شتە پێویستییەکانی کۆکردەوەو لەوە دڵنیابوو کــــە دەنــکە
شخاتەکانی پێیە ، ئەشیاکانی لەسەر پشت قایم کردەوەو کــــەوتە
رێ ، قاچە شکاوەکەی زۆر ئازاری ئەداو ئەمەش لەچــــاو ئــــەو
ئازارەی کە گەماڕوی ریخۆڵەکــانی دابوو هیچ نەبوو • • ئازاری
برسییەتی تەحەموڵ نەئەکراو ئەو درکو گیایەش کە بە ناچــــاری
ئەیانخوارد گریان تێبەردابوو لە ناو زمانو قورگیدا •

گەیشتە دۆڵێك پڕ بوو لەو تەیرانەی لە قەتێ ئەچن ، دڵی بەم
تەیرانە خۆش بوو ، دەستی بــــە بەردبارانیان کــــرد ، بێ نەکرا
یەکێکیان بپێکێ ، ناچــــار بوو ئەشیاکانی بخاتە سەر ئەرزو دوی
تەیرەکان کەوێ وەك پشیلەو مشك ڕاوکردنی •• بە بێ ئــەوەی
ئاگای لە خۆی بێ تاشە بەردێك جلو بەرگەکانی دڕیو قــــاچی
بریندار کرد ، بەلام ئازاری قاچی لەچاو برسییەتیدا خــۆی پێی
نەئەگیرا ••

جارێــکیان پێی کرا یەکێك لەم تەیرانە بــگرێ بەلام توانی

بفڕێ • جونی به ئەبرەکان بەگشتی‌دا ، که زانیش هێزێ ئەوەی تیادا نی‌یه یەکێکیان بگرێ ئەتو مەکەکانی دایه کوڵو رویشت •• دۆڵو جیای بڕی چاوی به ترێکەی بیست ئاسك کەوت ، زۆر لێ دوور بوون ، هەستی کرد پێویسته پیان گرێ چونکه برسی‌یەنی‌یەکەی له حەد بەدەر بوو ، رێوی‌یەکی بینی قەتەیەکی بەدەمی‌یەوه بوو ، هاوارێ لێ کردو بەسەریا قیژاندی ، رێوی‌یەکه ڕای کردو نیچیرەکەی له گەڵ خۆیدا برد •

دەوروبەری سەعات پێنجی ئێواره بوو کاتێ که گەیشته کەناری رووبارێکی بچکۆلانه له ناو دۆڵەکەیدا ئەهاته خوارێ ، ئەوعه گیایەك بینی وەك پیاز سەوز بوو ویستی لێ بخوات کەچی بێ تام بوو •

سەرەرای ئەوەی زۆر برسی بوو هەستی به ماندووبوونێکی بێ ڕاده ئەکرد ، زوو به زوو هەنگاوی ئەنا به نیازی ئەوەی بگاته شوێنێك هەندێ خواردەمەنی‌ی تیادا دەست کەوێ •

زۆر جاریش ئاوڕی لەم لاو ئەو لای رووبارەکەی ئەدایەوه بەشکوم چاوی به بۆقێك ، دەعبایەك بکەوێ ، بەڵام رەنجی بێ بەر • چونکه لەو هەرێمه دوورانەدا نه بۆق ئەژی‌و نه دەعبا •

دنیا تاریك بووەوه ، مانگەشەو بوو ، له دەریاچەیەکی بچکۆلانەدا ماسی‌یەکی بینی ، هیچی بۆ نەمابوو شێت بێ‌و وەك گیانلەبەرێکی دڕنده هێرشی برده سەر ، ماسی‌یەکه خۆی دەرباز

کردو نوقمی ئاوەکە بوو ، جارێکی‌تریش تەقەلاکەی دووبارە کردە وە .. کە خەریکی گرتنی ماسی‌یەکە بوو کەوتە ناو ئاوەکــەو جلەکانی تەڕ بوون ، هەستی بە نائومێدی کرد ، کەچی کۆڵی نەدا ، شەڕەکە لە نیوان ئەمو ماسی‌یەکە زۆر توندو تیز بوو ، لــە کۆتایی‌دا هیچی بێ نەکراو ئازاری برسی‌یەتی گڕی گرتەوە • • بەجــۆرێ‌و بۆلە بۆڵ کەوتە ڕێ‌و پاشان بوو بە قیژە قیژو هاوار کردن‌و وەك منالێکی ساوا دەستی بە گریان کرد •

ئاگری کردەوە بۆ ئەوەی لەشـــە ساردو سڕەکەی گــەرم بکاتەوە ، خۆیەتەکەشی لە سەر بەردێکی گەورەدا هەڵدا وەك شەوی پێشوو ، دڵنیـــا بوو کە دەنــگە شختەکانی بێ‌یە ، سەعاتەکــەی سوڕاند ، نوینەکانی هێشتاکە هەر تەڕ بوون‌و قاچیشی ئازاری دەدا • بەڵام ئەمە هــەمووی وەك ئازاری برسی‌یەتی نەبوون ، شەوەکــەی بردە سەر ، بەڵام بەدیژایی شەودا هەر خەو بــە خواردن ئەبینی ، ئەو خوراکەی کە بەم‌لاو بەولا دابەش ئەکرا وهەر یەکــە بــە ئارەزووی خۆی لێی ئەبرد کەچی خۆی ئیستاکە لێی بێ بەشە •

بەیانی زوو خەبەری بووەوە ، هەستی بــە ســەرماو نەخۆشی ئەکرد ، رۆژ هەڵنەهــاتبوو ، ئاسمانێکی تاریك‌و هــەوایەکی توندو تیژو بەفریش شوێنە بەرزەکانی بە رەنگێکی سپی بۆیاخ دابووەوە •

هەستی بەوە کرد کە ئەم رۆژەی شەڕی لــە دڵدایەو لەبەر ئەوە پێویستە هــەتا زووە ســەم‌شوێنە جێ بهێڵێ • • ئەشیاکانی

کۆکردەوەو خێرا خێرا کەوتە ڕێو ئەوەی ڕاستیش بێ ئەمە جاری یەکەمی نی‌یە کە ئەم جۆرە بیرانە بکاتەوە ، چۆنکە هەمیشە ئەوەی ئەمانە بەر چاو کە پێویستە بە زووترین کات بـکاتە شوێنێکی هێمن یاخود بـکاتە پێل ی هاورێ‌یی .

لەو ساتەدا هەرچی ئاواتو ئامانجی هەبوون بە گشتی لە یەك شت کۆدەبوونەوە ئەویش مەسـەلەی خواردن بوو ، برسی‌یەتی عەقلی لەسەردا فڕاندبوو . نەیئەزانی چـۆن ئەڕواتو بۆ کوێ ئەچێ .. تەنیا ئاواتی ئەوە بوو خواردنی دەست کەوێ .

کە شەو هاتو هیچی دەست نەکەوت ئاگری پێ‌ی بـکاتەوە ناچار بوو تەحەمولی برسی‌یەتی‌و سەرما بـکات بخـەوێ .. بەفرەکەش بووە بارانێکی یەکجار توندو تیژ ، بۆ چـەند جارێك خـەبەری بووەو دی دەمو چاوی بـە ئاوی باران شوڕاوەتەوە .. بەیانی باران لە بارین کەوت بەڵام خۆر هەڵنەهات ، دنیا تار وتەڵخ بوو ، سامناكو ناخـۆش بووو سەرەرای ئەمانیش بەگشتی ئازاری برسی‌یەتی‌و قاچە بریندارەکەی کـە خوێنی لێ ئەچوو .. هـەر چەندیشە کە لێ ئاشکرا بوو رێگەی بزرکردووە بەڵام هەر لەسـەر رۆیشتنی بەردەوام بوو .. هەندێ جار بە ناچاری پشوویەك ئـەدا چۆنـکە ئازی لەبەردا نەمابوو ، هەندێ جاریش پەنای ئەبردە بەر درك‌و گیاو ئەیانجاو کە قوڕگی وشك ئەبووەوە تفی ئەکرد ، دڵیشی کەوتە لێدانێکی یەکجار زۆر بۆیە بۆ چـەند جارێك ئەبورایەوەو لەهۆشی خۆی ئەچوو ئەکەوتە سەر ئەرز .

بوەڕێ بوو کـــاتێ لەناو ئاوەکەدا چـــاوی بە دوو ماسیی بچکۆلانە کـــەوت ، هەر یەکێکیان بە قەدەر پەنجەی دەستێ درێژ بوو ، ئـەو بەڕێ فڕێو فێڵو وریایی بەکـــار هێنـــا بۆ ئەوەی بیانگرێ ، لە ئەنجاما هەردوکیانی گرتو بەمە توانی بە سەر ئازاری برسیەتی‌دا زاڵ بێت ، دوو ماسیەکـــەی خـــواردو ســـێیانی تریشی بینی ..

بەم جۆرە مەتێدەی گیرودەی خەوتن بوو ئنجا نوڕەی ئازاری دڵەتی .. کەبیشتە شوێنێکی ســـەیر لـــە شوێنەکانی‌تر ناچێت . ئاسکی زۆرو گۆرگی بێ ژمارە .

شەوێکو دوانی بەسەر برد ، بەیانی کـــە خەبەری بووەوە نوڕەکە پێستینەکەی دەرهێناو کردی‌یەوەو هەندێ خوڵە زیری لێ دەرهێناو کردیە دوو بەش ، هـــەر بەشێکی نایە ناو کیسەیەکی تایبەت ، تفەنگەکەی هەڵـگرتو بە جوانی سەیری کرد ، بێگومان کە بـگاتە (ریفاردیز) فیشەکی بۆ پەیدا دەکات .

ڕۆژەکە نەماوی بوو ، کوت وبڕ برسیەتی‌یەکەی خـەبەری بووەوە ، هەستی بە شەکەتی کرد ، کە چەند هەنـگاوێك ئەرۆشت ئەکەوتو راست ئەبو وەوە ، بـە لای هێلانەیەکدا تیەڕی چـوار بەچکە قەتەی تیادا بوو ، بێ ئەوەی ئاگـــای لـە خۆی بێ هـــەر چواریانی قووت دایەوەو هەندێ توێکلی هێلکەی کۆنی تیـادا بوو ئەوەشی خوارد .

تەیرەکە کە ئەم کارەساتەی بینی وەك شێت‌و هاری لێ هات‌و هێرشی هێنایە سەر پیاوەکەو ویستی بە چڕنوك چاوەکانی لە کەللەی دەربێنێ • بەڵام توانی خۆی بپارێزێ‌و بە تفەنگەکەی شەڕی لـــە گەڵدا بکات‌و لە دوایی‌دا باڵێکی بشکێنێ ، ئیتر باڵندەکە ڕای کردو ئەمیش بـــە غـار بە دوایدا بەرکردنەوەی لـــە تام‌و چێـــژی گۆشتی ئـەم جـۆرە تەیرانە وای لێ کـــرد زیاتر هـەست بـە برسی‌یەتی بکات‌و حەز لە خواردن بـــکات ، چاوێ بەم‌لاو بەولا ئەگێرا بە مەبەستی بەدیکردنی تەیرێك ، گیان‌لەبەرێك کەچی دنیاو شارێـکی ویران •• دەستی بە هاوارکردن کرد ، پاشان ئەو باڵندە جـەرگ سووتاوەی بینی ، کـــەوتە دوای ، ئەویش بـە باڵێـکی شکاوەوە ڕای کردو ئـەم مەسەلەیە ماوەیەکی زۆری خـــایاند تا پیاوەکە لەناو دوڵەکەدا خۆیی بینی ••

لەو دۆڵە یەکجار قووڵەدا کە بەرەو پێشەوە ڕوانی چاوی بـە هەندێ شوێنەوار کەوت •• گومانی لەوەدا نەبوو کە شوێنەواری خۆی نی‌یە ، واتـــە دوور نی‌یە جێ پێی (پیل) بێ ، بەڵام ناتوانێ چاوەڕوان بـکات‌و بـگەڕێ بە دووی هـاورێ‌یە ڕاکردووەکـەی پێویست ئەوەیە پێش هەموو شتێك ئەو باڵندەیە بگرێ •

زەلامەکە توانی باڵندەکە شەکەت‌و ماندو بـکات ، ئەمە لـــە کاتێکدا کە بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ خۆیشی لە کاردا خست ، کەوتە سەر ئەرزو هێزێ ئەوەی تێدا نەمـــا بستێك ڕێـگە ببڕێ ، باڵندەکەش یەکجار نزیکی بوو ، نزیکەی دە پێی لێ دوور بوو ×

کەچی بێ نەنەکرا ئەو تەیرە بەستەزمانە بگرێ . کە هاتە سـەر خۆیو بەئاگا بووەوە باڵندەکەش بـە ئاگـا هاتبووەوە ، ئیتر بۆ جارێکیتریش بەزمەکە دەستی پێ کردەوە ، بەڵام تاریکایی وای لە باڵندەکە کرد لە داوی گرتن دوور بکەوێتەوە ، زەلامەکـەش لـە بەدوکەوتنی وازی هێنا .. ئەوەی بێ بوترێ هێز .. توانا لـەلای ئەمدا نەمابوو ، بۆ جارێکیتر کەوتە سەر ئەرزو بەم حاڵە تا بەیانی خـەوت .

ڕۆژی دووەم لەچاو ڕۆژی یەکەمدا زۆرتر تەماویو تاریك بوو ، زوربەی پێنخەفەکانی بە تیمار کردنی قاچـە شکاوەکەیدا سەرف کردبوو و دڵنیا بوو لەوەی بـە تەواوەی شوێنـەواری هاورێیەکەی ون کردووە . تۆ بڵێی کەسێکیوا هەیە وەك ئەم لەم هەرێمە دوورانەدا ڕێگەی بزر کردبێ ؟ ئەم پرسیارەی کرد ، ئای لەم دەردە سەختەی کە تووشی بووە ، ئای لە ئازاری برسیەتی کە عەقڵو هۆشی لە سەر بردووە ! ئای لەم برسیەتییە کوشندەیە کە هەستی پێ ئەکا ! هەستی بە گرانی بارەکەی سەر پشتی کرد ، بۆیە زیرەکەی دەرهێناو هەندێـکی لێ فڕدایەوەو لە پاش نیوەڕۆشـدا بەشەکەی تریشی کردە نەسیبی بەفرەکە ، ئیتر جگە لـە هەندێ پێنخەفو تفەنگەکەی هیچیتری پێ نەمایەوە .

لەناکاو کەوتە ناو بیروڕایەکی سەیرەوە ، گومانی لەوە پەیدا کرد کـە تفەنگەکەی فیشەکی تێدا نییە ، ئەمە لە کاتێدا کـە چاك ئەیزانی بەتاڵە ، بەڵام ئیتر بڵێین چی ؟ لە خۆیەوە تووشی ئەم خەیالە

قوڕە بوو •• خەیاڵەکە لە گەڵ عەقڵیدا کەوتبووە زۆرانبـــازی ، تەماشای تفەنگەکەی کرد ، لێ ورد بووەوە ، فیشەگی تیادا نی یە ، هەستی بەو پەڕی ئائومێدی کرد ••

لە پاش نیوسەعاتدا خەیاڵەکەی دیسانەوە هاتە سەری‌و دوو بارەو سێ بارە ئەبووەوەو هـەموو جارێك تفەنـگەکەی ئەپشکنی‌و لە بەتاڵی‌یەکەی دڵنیا ئەبووەوە ، ئیتر بەم جۆرە تا ماوەیەك مایەوە تا ڕادەیەك جارێـکیان کە چاوی کردەوە ئەسپێـــکی بینی •• لـــە سەرەتادا بڕوای نەکردو بە دەستکردی خەیاڵی دانا ، دەستی بـە چاویدا هێناو بە وردی دقەتی‌دا بینی کە گیان لەبەرەکە ئەسب نی‌یە بەڵکو ورچێکی گەورەیەو ئەویش لە دوورەوە تەماشای ئەکات •

لوولەی تفەنگەکەی ڕوو بە ڕووی ورچەکە کرد ، کـە هاتە بیری بێ فیشەگی تفەنگەکە خستی‌یە شوێنەکەی خۆی‌و چەقۆیەکی دەرهێنـــا •

ئیستاکە گیان‌لەبەرێکی لە بەردەمدایە کـە گۆشتێکی زۆری بێ ئەبەخشی‌و ژیانە بزربووەکەی بۆ تازە دەکاتەوە ، چەقۆوەکە تـــا بڵی تیژ بوو ، گەر هێرش بەرێتە سەر ورچەکە بێ گومان ئەیکوشی، بەڵام لێدانی دڵی دەسێ کرد بەئازاردانی‌و قاچە شکاوەکەشی هاتەوە مەیدان •

ئەو تۆزە ئازایەتی‌یەش کە هەیبو وردە وردە کپ دەبووەوە ، ترس بە سەریا زاڵ بوو ، لەوە ئەترسا ئیستاکە ورچەکـــە هێرش

بەرێتە سەری •• بێ جوڵە وەستاو •• ورچەکە دوو هەنگاو لێ هاتە پێشەوەو راوەستا •• زەلامەکە پێ نەکرا ڕا بکات نەوەك ورچەکە دوای کەوێ •• کە هێرش بەرێتە سەری رەنگە سەرنەکەوێ ، کوت و بڕ هەستی بەوە کرد کە ئازایەو قووەتەکەی جارانی وردە وردە بۆی ئەگەرێتەوە ، ئەم ئازایەتی یە هی مرۆڤێکی ناومێدی ترسنۆکە ، مرۆڤێك بەرگری لە مەسەلەی ژیان و مردن •• مان و نەمان ئەکات ، بۆیە بەو پەڕی تواناو ئازایەتی ڕو بە ڕوی ورچەکە بووەوە •

ورچەکە جوڵایەوە بەڵام ئازایەتی ئەم ئادەمیزادە سەیرە جێگەی سەرسوورمان بوو •• زەلامەکە نە جوڵایەوەو وەك بەریکەرێك راوەستاو سەیری ورچەکەی ئەکردو بیری لەوە ئەکردەوە چۆن لە خەتەری ئەم گیانلەبەرە خۆی بپارێزێ •• یاخود لە گورگ گەر لەم مەترسی یە رزگاری بوو •• ئەوەی ڕۆیدا جارێکیان تووشی بوو بە تووشی گورگێك ، راستر گەلە گورگێك ، بەڵام بە قەنێ ڕاوکردن خەریك بوو ئاگای لەم کابرایە نەبوو ••

ئێوارە لە پاش ئەوەی لە دەست ورچەکە نەجاتی بوو هەندێ ئێسقانی بینی کە گورگەکان بەجێیان هێشتبوو ، ئێسقانی ئاسك بوون ، گوشتەکەیان خوڕا بوو ئێسقانەکەیان بۆ یاوێکی برسی وەك ئەم بەجێ هێشتبوون •

به جاوێـــکی برسی‌و سەرسام ســـەیری پاشماوەی ئـــەم گیانلەبەرەی کردو بیرێشی لە رووداوەکـــانی رۆژانی پێشـــووی ئەکردەوە .. خۆزگەی بە مردن ئەبرد ..

ئنجا مردن چی‌یە ؟! هیچ نەبێ خەوێکە ئاسوودەیی بە لـەش ئەدات !

ئەم بیرکردنەوەیە زۆری نەخایاند بەلاماری ئێسقانێك‌داو بـە دان تیا بەر بوو ، بەڵام ئێسقانی چی ، بۆ چی گورگەکان هیچیـــان پێوە هێشتبوو بە کەڵکی خواردن بێت ؟!

کابرا چۆنکە زۆر برسی بوو هەستی بە تام‌و لەزەتێکی یەکجار خۆش کرد ، هیچ نەبێ تامی گوشتی کرد ، کە قەپی لە ئێسقانەکاندا ئەگرت ئەتوت بەرختێکی برژاوی لەبەردەمدایەو بە تایبەت بۆ ئـەم ئامادە کراوە .. دانەکانی توانای ئەوەیان نەبوو ئێسقانەکان بهاڕن بۆیە هەندێکیان تووشی زەرەو ئازار بوون .. ئیتر ناچار بوو لـــە ئێسقان کرانەوە واز بهێنێ .

بەفرو بارانێکی زۆر باری‌و بەم حاڵەتە چەند رۆژێکی بەسەر بردو ئیتر وای لێ هات هەست بە مەسەلەی کـاتو رۆژو شـــەو نەکـــات .

ئەرۆیشت بەرێوە بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ ، کـە ماندوو ئەبوو پشوویەك ئەدات‌و ئەوەی بۆ بـەردەوام بوون هـــانی‌ئەدان مەسەلەی مان‌و نەمان بوو .

باشان گەیشتە رادەیەك هەست بـــە هیلاکی نەکـــات • • دەمارەکانی سڕ بوونەوەو خەیاڵو خەونو سەرسامی سواری سەری بوون • دەستی کردە مژینو جواندنی ئەو ئێسقانانەی کە لە گەڵیـا هەڵیان گرتبوو •• وازیشی لەوە هێنا کـە بە ناو دۆڵو گردەکاندا بڕوات •• رووبارەکـەی کردە نیشانەدەری خـــۆیو لـــە گەڵیدا بەرەو دۆڵەکە کەوتە رێی • کە بەڕێوە ئەڕۆ شت هیچی نەئەبینی نە رووبارو نە دۆڵ ئەوەی بە سەریدا زاڵ بوون خەیاڵو ســەودا سەری بوون •• گیانو جەستەی وەك دوو شتی جیاواز وابوونو توانی یەکگرتنەوەیان شتێکی محاڵ بوو ، ئەوەی بەیەکەوە کۆیان کردبووەوە دەزوویەکی باریك لە وەی جالجالۆکە ئەچوو •

کە هاتە سەر خۆیو بەئاگابووەوە بۆی ئاشکرا بوو کـــە لە سەر ئەرزەکە کەوتووە ، رۆژ هەڵاتبوو دنیاش گەرم بوو ، لــــە دوورەوە دەنـگی ئاسکێکی هاتە بەر گوێ ، بەفرو بارانە زۆرەکەو گەردەلوولەکـە راستو چەپی پێی کرد هاتەوە بیر ، بەڵام ئەوەی لـە بیری نەمابووە ماوەکە بوو ، ئەم حاڵەتە چەندی خایاند •• دوو رۆژ •• دوو حەفتە •• زیاتر •• ئەوەی لە بیردا نەما بوو •

بەبێ ئەوەی بجوڵێتەوە تۆزی راکێشا •• هەستی بە خۆشیو گەرمایی رۆژەکەی کرد ، لای وابوو ئیتر هەروا ئەبێ •• هەولی‌دا ئەو جێگەیە دەستێشان کات کە ئیستاکە تێدایەتی ••

ئەوەی پێ کرا •• زۆری لە خۆی کرد بۆ ئەوەی بەسەر لادا

بکەوێ •• تەماشای ئەو رووبارەی کرد کە لە سەری کەوتووە •• بە مەزەنە بۆی دەرکەوت رووبارەکە بە ناو دۆلەکەوە بەرەو دەریا ئەڕوات ، هەتا ئەم مەسەلەیەش بکرە بەلای ئەودا شتێکی راستەقینە نەبوو بەڵکو وەك خەیاڵ وابوو •

چـاوی نووقاند پاش تۆزێك کردی‌یەوە •• تابلۆوەکـــە هەر وەك خۆیەتی‌و نەگۆڕاوە ، واتە خەیاڵ نی‌یەو ئەوەشی ئەزانی کە لەم جۆرە هەرێمانەدا پاپۆڕو دەریا بەر چـاو ناکەوێ •• واتـە وەك چۆن لە تفەنگەکەی دڵنیایە کە پێ فیشەکە ئەمەش وەها ••

لە لایەن پشتی‌یەوە گوێ لە ناڵە ناڵێك بوو ، بە هێمنی ئاوڕێ دایەوە ، چۆنکە ئازار ئارامی لێ بڕیبوو ، هیچی نەبینی ، خـــۆی متدایەوە گـوێ ڕاگرت ، بۆ جارێکی‌تر هەمان ناڵەی بیستەوە ، ئەم جارە کۆکینی لە گەڵدا بوو ، لە نیوان دوو بەردا بۆرە سەرێك وەدەرکەوت ، زانی سەرەکـــە هی گورگێکی دڕندەیە ، وای بــە خەیاڵدا هات ئەم گیـــانلەبەرە نەخۆشە ، چۆنـــکە بەبەردەوامی ئەینالاندو ئەکۆکی‌و بە زۆر ئەجولایەوە ••

ئیتر بۆی ساغ‌بووەوە کە شتەکە خەیاڵ نی‌یە ، ناچـــار وای لێ‌هات بە چاوێك بۆ گورگە دڕندەکە بڕوانی‌و بە چاوێکی بۆ ئەو دەریا دوورەو ئەو پاپۆڕانەی کە لە ناویدا هاتوچو ئەکەن •

کەواتە ئەم زەلامە بە ڕێگەدیارو دەستنیشان کراوەکەدا بەرێوە ناڕوات بەڵکو بەرەو باکووری رۆژ هەڵاتی «دیز دیفید»و لەوێشەوە

بەرەو دۆڵی «کوبرمین» ڕێگەی گۆڕیوە •• وانە ئەم دۆڵە فووڵە دۆڵی (کۆبرمین)ە وئەو دەریایە ئوقیانووسی بەستراوە (المتجمد) •• ئەو پاپۆڕەش یەکێکە لە پاپۆڕەکانی کۆمپانیای (هدسۆن‌بای)یە بەم جۆرە مەسەلەکەی بە شێوەیەکی ڕاستە قینە بۆی ساغ بووەوە •

تۆزێ دانیشــــتو بیری کردەوە چ بــکات • • ســـەیری سەعاتەکـــەی کرد •• سەعـــات یازدەی پێش نیوە ڕۆیە • • نە تفەنگ‌و نە چەقۆوەکەی پێ مـــاوەتەوە لـــە بەتانی‌یەك بــەولاوە هیچی تری پێ نەماوە •• دەنــکە شخاتەکانیش هـــەتا ئیستاکـــە نەفەوتاون‌و هیچ زەرەرێکیان بەر نەکەوتووە •

هەرچــەندە کە لەو پەڕی شەکەتی‌دا بوو کەچی بیرو عەقڵ‌و هۆشی وەك خۆیان وابوون‌و لەکار نەکەوتبوون ، ئازارو قاچـــە شکاوەکەی لە بیری نەمابوون ، هەستی بە برسی‌یەتی نەئەکرد ••
ئەوەی بیری لێ ئەکردەوەو بە پێویستی ئەزانی ئـــەوە بوو چۆن خۆی بگەیێنێتە ئەو پاپۆڕە کە لە دوورەوە ئەیبینێ ••

کەڵکی ئەوەی نەمابوو بــکەوێتە ڕێی ، گامووڵەی ئەکردو بەبێ ئەوەی ئاگـــای لە خـــۆی بێ ڕوی‌کردە گیـــان‌لەبەرە نەخۆشەکە •• سەیر لەوەدا بوو کە گورگەکە بە هەناســـە بڕکی هەوڵی ئەدا لێ دوورکەوێتەوە ، کابرا بە دیتنی زمانی زانی کـــە بەرەو مردن ئەچێ •• زەلامەکـــە هەستی کرد توانای ڕاوەستانی هەیەو پێویستە وردە وردە ڕێگاکە ببڕێ ، بەڵام ئەبێ کات نا کاتێ

راوەستێ‌و پشوویەك بدات.. هەنگاوەکانی تا بلێی کورت‌و قورس بوون ، دڕندەکەش لەم چاکتر نەبوو ، ئەویش لەو پەڕی شەکەتی‌و نەخۆشی‌دا بوو ..

کە شەوداهات‌و دەریاکە بڕینەی دایەوە بۆی ساغ بووەوە کە نزیکەی چوار میلێك لە دەریای نەجات بووندا دوورە .

بەدرێژای شەودا گورگەکە لە ناڵەناڵ‌و کزکین نەکەوت .. ئاسکەکانیش لە هاوار کردن بەر دەوام بوون .. کابرا هەستی کرد کە هیوای بەژیان‌و دەرباز بوون بەرەو بەهێزی ئەڕوات . ئەوەشی ئەزانی کە ئەو گورگەی وەدوی کەوتووە بە هیوای ئەوەیە ئەم بمرێ‌و لە ئەنجاما ببێتە هۆی ژیانەوەی ئەو .. ئای کە واتە مەسەلە مان‌و نەمانە .. بەردەوامی ژیانە ! کە بەیانی بووەو زەلامەکە چاوی کردەوە بینی گورگە بە چاوێکی برسیەوە بۆی ئەڕوانێ‌و لە سەرمادا ئەلەرزێ‌و کلکی درێژ کردووەتەوە ..

ڕۆژ هەڵهات‌و کابراش بەرەو پاپۆرەکە کەوتە ڕێ .. دنیا خۆش‌و جوان بوو ..

پاش نیوەڕۆ گەیشتە ڕێگەیەك بەهۆیەوە زانی زەلامێك پێش ئەم پێیا چووە .. شوێن‌پێیەکە وا ئەگەیێنێ کە ڕێبوارەکە بە پێ نەڕۆشتووە بەڵکو قاچو دەستی بەکار هێناوە . تۆ بڵێی ئەو ڕێبوارە (بیل)ی هاوڕێ‌ی بێ ؟ ئەمەی لا گرنگ نەبوو چونکە ئەوەی هەستی پێ بوترێ لەلا نەمابوو .. دەمارو ناو سکی لە

خەودا بوون ، ئەوەی باڵی پێوە تــەنا تەنیا زیانەوە بوو .. لــەو بەڕی شەکەتی‌دا بوو .. کەچی خۆش‌ویستنی ژیان لــە قووڵایی ناخی‌دا بە گڕ مردندا ئەچوو ، لەبەر ئەوە گیــاو دڕکی لە ئەرزدا دەرئەکردو ئەیخواردو ئاگاتی لە گورگەکە بوو ..

ڕێکەی ئەو زەلامەی گرت کە لە پێشی‌یەوە ڕۆشتبوو ، کــە گەیشتە کۆتایی ڕێـگاکە کومەڵە ئێسقانێکی بینی ، ڕانە گورێك گەماروویان دابوو ، لەولاشەوە تورەکەیەکی بەدی کرد ، تورەکەکە وەك ئەوەی خۆی وایە بەڵام بە دان ئەنجن ئەنجن کراوە ، بە هەزار حاڵ توانی هەڵیگرێ چۆنــکە ئەو قورس بووو ئەمیش بێ‌هێز .. واتە (پیل) زێرەکەی تا دوا هەناسەی پاراستبوو .. ئای چەند گێلو دەبەنگ بوو !.. بە هاورێ‌یەکەی پێتەکەنی چۆنــکە غــەدری لێ کردبوو بەجێی هێشتبوو .. ئیستاکە تورەکە زێرەکەی لە گــەڵ خۆیدا ئەبا بۆ پابۆرەکــەو سوودو قــازانجی لێ وەر ئەگرێ .. لەناکاودا وازی لە پێکەنین هێنا چۆنکە عەیبە گاڵتە بە هــاورێ‌یە مردووەکەی بکات .. جش لە ئاڵتوونو ئێسقانەکان ..

لە شوێنەکە دوور کەوتەوە ، گەیشتە زەلکاوێك تۆزێ ڕاوەستا بە ئومێدی ئەوەی هەندێ ماسی بگرێ ، ئاوەکە ئەوەندە ساف بــوو توانی بەهۆی‌یەوە چاوی لە وێنەی خۆی بێ ، بەڵام ئای لــەو وێنە ترسێنەرو سامناکە ! چاوی بە سێ ماسی کــەوت ویستی بیانــگرێ بەڵام ڕەنجی بە فیڕۆ چوو ، لەوەش ترسا گەر بێتو زیاتر بەســەر ئاوەکەدا شۆڕبێتەوە نەتوانێ لەبەر لاوازی خۆی بگرێو لە پاشــان

بکەویتە ناوی‌و بخنکێ ..

لەو رۆژەدا لای وابوو کـــە تەنیا بڕینی سێ میلی ئەویێ بۆ گەیشتنی بە بابۆرەکەو لە رۆژی دووەمدا دوو میل .. ئیتر وای لێ هات نەتوانێ بەپێوە بڕوات بەناچـــاری دەست‌و قاچی خستەکار ، واتە وەك (بیل)ی هاوڕێی گامووڵەی ئەکرد .. پاش حەوت رۆژ بۆی ساغ بووەوە کە حیساباتەکەی لە حەقیقەتدا دوورن ، چونـکە بۆ گەیشتنی بە بابۆرەکە پێویست بە رۆیشتنی حەوت میل ئەکـات‌و ئەمیش تواناى ئەوتۆی نی‌یە لە رۆژیکدا زیاتر لە یەك میل بڕوات .

لە گامووڵە دوورودرێژو سەختەکەی‌دا بەردەوام بوو ، جارێ ئەرۆشت‌و جـــارێ ئەبووڕایەوە ، هەردوو ئەژنۆی لە شەکەتی‌دا شکان‌و وەك گوشتێکی کوتراویان لێ هاتەوە ، خوێن بــە ســـەر ئەرزا ئەتـــککا ، بۆ دواوە ئاوڕێـــکی دایەوە ، گورگەکەی بینی خوێنەکەی ئەلستەوە ، لێرەدا مەسەلەی مردنی هــاتە پێش چـاو ، واتە گەر بێت‌و لەم گورگە رزگاری نەبێ ئەبێ بمرێ ، بەم جـۆرە گەورەترین تراژیدیا لە تراژیدیاکانی ژیان پەیدا دەبێ .. پیاوێکی نەخۆش گامووڵە ئەکات‌و گورگێکی نەخۆش بە دوایا ئەڕوات ، دوو گیان لەبەر یاخود پاشماوەی دوو گیان لەبەر هەر یەکێکیان ئەیەوێ ئەوەی‌تر بفەوتێنی بۆ ئەوەی خۆی بمێنێ ..

ئەگەر بەتباو گورگەکە لە گورگ بچوبایەو ساغ‌و سەلامەت بوایا زەلامەکە ئەوەندە دەربەست نە ئەبوو ، بەڵام ئەوەی زۆری لا

گران بوو که بیته خوارکی ئەم گیانلەبەرە عاجباتیو بەربەووتەو
نەخۆشە که هیچی بۆ نەماوە بمرێ •• دیسانەوە وای لێ هات عەقڵو
هۆشی لە سەردا نەمێنێو بەرەو جیهانی خەیاڵو لێکدانەوە
بگەرێتەوە •••

جارێکیان که خەبەری بووەوە لە پەنا گوێیەوە هەستی بە
وززەیەکی کرد ، گورگەکە ترساو گەڕایەوە دواوە ، ئەمیش
بواریەوە ، پیاوەکە ترسی نەبوو ، چۆنکە لە فەرهەنگەکەیدا هیچ
جۆرە مانایەك بۆ وشەی ترس نەمابوو ، بیری تەنیا لای ئەو پاپۆرە
بوو که نزیکەی چوار میل لێ دوورە •• ئیستاکە ئەتوانێ بە چاو
ببینێ •• فەنەرو بەلەمە بچکۆلەکە بە چاکی دیارن ، بەلام ئاخ بێ
ناکرێ ئەم ماوەیە ببرێت !•• ئەمەی چاك ئەزانیو ئەشیزانی کە
لە دوای ئەم هەموو رەنجو هەوڵو تەقەلاو کوێرەوەرییە نابێ
بمرێت • ئەیەوێ بەسەر تەنگو چەڵەمەو گیروگرفتدا سەر
کەوێ ••

چاوی نووقاندو وەك شەرێتێکی سینەما رووداوەکانی پێشووی
هێنایە بەر چاو •• ئیستەش کەوا لە کۆتایی رێگاکە نزیك بوەتەوە
تۆ بڵێی دان بە تەسلیم بوون دابنێ ؟•• چۆن ئەبێ هەست بە لاوازی
بکاتو سەعاتی رزگار بوونی زۆر نزیکە ؟!

بێ ئەوەی هیچ جوڵەیەك بهێنێ لەسەر پشت راکشا ، لە ناکاو
گوێ لە هەناسەی گورگە نەخۆشەکە بوو وردە وردە لێ نزیك
ئەبێتەوە ••

له نیوان ئەمو گۆرگەکەدا تەنیا هەنگاوێك بوو ، کەچی باکی نەبوو ، هاتە پەنا گۆی هەستی بە زمانە تیژەکەی کرد رووەمەتـــی ئەلستیەوە •• ویستی بەدەست ئەو زمانە بگرێو لە رەگو ریشەوە دەری بهێنێ بەڵام جگە لە بۆشایی هیچی بەدەستەوە نەهات •• زانی کە ئەوەی هێزی پێ بوترێ تیادا نەماوەو هیچی پێ ناکرێو بـۆ هیچ جۆرە کارێك دەست نادات ••

خۆڕاگرتنو سەبووری گۆرگەکە زۆر سەیر بوو و لەویش زیاتر سەبووری پیاوەکە بوو ، چۆنکە تا نیوەڕۆ بەم حاڵەتەو بە پێ

زیاتر سەبووری پیاوەکە بوو ، چۆنکە تا نیوەڕۆ بەم حاڵەتەو بە پێ

ئەوەی جووڵەیەکی لێ بێ مایەوەو چاوەڕوانی ئەو هەلە بوو کـە دڕندەکە تیادا هێزشی بباتە سەرو کۆتایی پێ بهێنێ ••

بەشێوو لاوازو بێ ئاگا بوو و لە دەریاکە بـەولاوە هیچیکە نەئەدی ، ئەو دەریایەی کە بەسـەر جەستەیدا شەپۆلی ئەدایەوەو جگە لەو زمانە تیژە نەخۆشە کە جار جارێ ختووکەی رووەمەتـە شکاوەکەی ئەکرد ••

ئاگای لە چرپەی هەناسەکانی گورگەکە نەما •• ئنجا لەناکاو کە بە ئاگا بووەوە بینی ئەو زمانی لە رووەمەتیەوە گەیشتووەتە دەستیو بیری لەوە کردەوە کە گیانلەبەرەکە نیـازی ئەوەیـە هەرچی هێزی تیا ماوەتەوە کۆی کاتەوەو پەلاماری بداتو دان لـە گۆشتەکەی گیرکاتو ئەو خواردنەی دەست کەوێت کە ماوەیەکی دوورو درێژە لێ بێ بەش بووە ••

ئەم هەراو هۆریایە ماوەیـەکی زۆر کەمی خایاندو پاشـــان کابرا یا ئەڵلای لێ کردو بەو هێزە لاوازەی هێرشی بردە سەر ، گورگی بەستەزمان ناچـــار بوو تەسلیم بێ‌و کـابرا بینی چـــۆن دانەکانی لە ملی گیان‌لەبەرەکەدا گیر بیوون .. پاش نیو سەعـــات هەستی کرد کە دەمی لە تووکی گورگەکەدا پڕ بوەتەوەو شتێکی بۆن پیس لە قورگی‌دا ئەچێتە خوارێ ..

ئیتر گەڕایەوە دواوەو لە هۆشی خۆی چوو ، پاشان بە ئاگا ســووەوە . .

ئەو پاپۆرەی کە ( بیدفورد )ی پێ ئەوترا ، خەریـکی ئەوە بوو کۆمەڵێکی لە پیاوە زانیارەکان بگۆیزێتەوە .. هەندێ لە تاقمی پاپۆرەکە چاویان بە شتێکی سەیر کەوت لە سەر کەناری دەریاکـە کەوتووە ، ئەم شتە سەیرە بەرەو ناو ئاوەکە گامــوڵە ئەکات .. پیاوەکان نەیانتوانی حەقیقەتی ئەمە بزانن ، بەڵام لەبەر ئەوەی لــە پیاوە زانستەکان بوون بەلەمەکەیان خستەکارو بەرەو کەناری دەریا کەوتنە رێ .. زۆریان لا سەیر بوو .. شتێکیان بینی لە ئادەمیزاد ئەچێ‌و لە نیوان مردن‌و ژیانە ..

لە پاش تێپەربوونی ســێ حەفتە بە ســەر ئــەم رووداوەدا ، زەلامەکە لە سەر کورسی‌یەکی خۆش لە ســـەر پشتی پاپـۆرەکەدا دانیشتبوو چیرۆکە ترازیدیایی‌کەی خۆی ئەگێڕایەوە .. فرمێسك بە سەر روومەتی‌دا ئەهاتە خـــوارێ .. باسی بەســەرهاتەکانی بـۆ ئەکردن‌و پێیانی ووت ناوی کی‌یەو چیرۆکەکەی چۆنە ..

باش چەند رۆژێك توانی لە سەر سفرەی نانخواردندا هاوبەشی خەلکەکەدا بکات .. تەماشایانی ئەکرد کە چۆن ئادەمیزار ئەتوانێ ئەم خواردنەی بە ئاسانی وەدەست بهێنێ ..

ڕقی هەڵئەستاو تورە ئەبوو کە ئەیانبینی زۆر ئەخۆنو بیر لە پاشە رۆژ ناکەنەوە ، هەمیشە بیری لەوە ئەکردەوە کە خواردنەکە کەم نەبێو لە چێشت لێنەرو نۆکەرو بەرێوەبەری زەخیرەو تاقمی پاپۆرەکە دەربارەی ئەم مەسەلەیە پرسیاری ئەکرد ... هەر یەکێك لەوانە هەوڵی ئەدا دڵنیای بکات کەچی بڕوای نەئەکرد .. ئەچووە لای کەشتیوانەکانو پسکتو نانی سواڵ ئەکرد .. لەتە پسکیتو نانەکانی لە ناو باخەڵیدا ئەیشاردەوە وەك گەنجینەیەکی بە نرخ ..

پیاوەکان بەگشتی چاویان لێ بوو و ڕێگەی ئەم کردەوانەیان لێ نەئەگرتن .. کە نوێنو جلەکانیان ئەپشکنی لەتکە نانو پسکیتو شتی تری خواردەمەنییان تیادا ئەدۆزییەوە .. زەلامەکە ئەو شتانەی بۆ پاشە رۆژ هەڵئەگرت .

کابرا هەرچەندە ئەم هەموو کارەساتەی بینی کەچی عەقڵی هەر وەك خۆی مابووەوە .. پیاوە زاناکان لایان وابوو هەر کە بگاتە ووشکایەتی لەم نەخۆشییە رزگاری ئەبێ .. ئەوەش ڕاست دەرچوو چۆنکە بە گەیشتنی پاپۆڕەکە بۆ کەنداڵی ( سان فەرەنسیسکو ) زەلامەکە وەك پیاوەکەی جارانی لێهات .

رۆژەکە هەتا بڵێی ساردو تاریك بـوو ، پیـاوەکە لە رێــگە سەرەکیەکەوە ڕۆی کردە جیاکە بەنیازی ئەوەی لەوێوە رێـگە سەختەکە بگرێتە بەد بە مەبەستی کۆکردنەوەی هەندێ کوتەڵــە دارو هێزم ••

بـۆ ئـەوەی کەمـێ بحەسێتـەوە تۆزێ دانیشـت ، سەیری سەعاتەکەی کرد بینی سەعات نۆی پێش نیوەڕۆیە ، هەرچەنــدە کە ئاسمان سافو بێگەرد بوو کەچی پێی نەئـەکرا هیـچ جـۆرە نیشانەیەك بۆ هەتاو بـەدی بـکات •• رۆژەکـە بەهۆی ئەو شـتە تاریـــکەی کە گـەمارووی جیهانـی دابـوو زۆر تاریـکو رەش هەڵـگەڕابوو • •

کابرا ئەوەندە رۆژی ئاوەهای بە چاوی خۆی دیبوو ئیتر ئـەم مەسەلەیە لەلای شتێکی سرۆشتی بوو •• بۆیە هیچ باکی نەبوو و ئەوەشی ئەزانی کە ئەبێ چەند رۆژێك تێپەڕی هەتا ئاسکۆڵە جوان لە لانەکەیدا بێتەدەری‌و دونیا گەرمو خۆش بێتەوە •• بۆ دواوە ئاورێکی دایەوە ، رووباری ( ئەلیۆکون ) بینی کە بە بەرزایـــی مەترێك شەختە بەسەریا دانیشتووەو لەسەر ئەم سەهۆڵەش بـــە بەرزایی مەترێکی‌تر بەفر بووەتە میوان ••

هەرچی چاوت پێ بکەوتبا سپی‌و بریقەدار بوو ، تەنیا هێڵێکی ڕەش نەبێ کە هەتا دوورگە دوورەکەش بگرە لە لایەن باشوورەوە ناوچەکەی بەگشتی گەمارۆ دابوو و تا لەبەر چاودا ون ئەبێ .

ئەو هێڵە ڕەشە بریتی‌یە لەو ڕێگە سەرەکی‌یە کە بۆ دەربەندی ( شلیکۆت ) ئەچێ‌و نزیکەی پێنج سەد میل درێژە ..

بەڵام ئەمانە بەگشتی : ڕێــگە دوورو عاجبــانی‌یەو دەرنەچوونی خۆرو سەرمای توندو تیژو مەسەلەی تەنیایی هیــچ کارێکیان تێ نەکردبوو نەك لەبەر ئــەوەی بــەم سەفــەرە سەختانــە ڕاهاتووە ، چونکە ماوەیەکی زۆر نی‌یە هاتووەتە ئەم ناوچەیــەو ئەمەش یەکەم سەفەرە کە لە وەرزی زستاندا ئەیــکات .

نەگبەتی ئەم زەلامە لەوەدایە دووربین نی‌یە .. ڕاستە زۆر بەهێزو ئازاو شارەزای گیروگرفتەکانی ژیانە بەگشتی ، بەڵام ئەمە شتێکی ترە ..

بەنجا دەرەجەی ژێر سفر سەهۆڵبەندان ئەگەیێنێ کە شتێکی ئاسان نی‌یەو مانای شەختەو تــۆف ئەبەخشێ کــە بەهیچ شێوەیەك تەحەموول ناکرێ ..

تەنانەت بە بیر کردنێکی کەم لەم بارۆدۆ خــەدا وای لــێ‌هات هەست بە ئەژنۆ تەزینێك بکات ، کەچی بیری لەوە نەکردەوە کــە ئەمیش ئادەمیزادێکەو لەبەردەم سەرمادا هێزو قووەتێکی تایبەتــی

هەیەو ئەوەی بەوێ لەمە زیاتر بڕوات ئەبێ چاوەڕوانی مردن بکات ..

کە پلەی گەرمایی بگاتە پانزەی ژێر سفر مرۆڤ ناچار ئەبێ جلو بەرگی تایبەتی لەبەر بکاتو ئاگای لە خۆی بێ ، کەچێ ئەم زەلامە لە پللەی پەنجادا ئەوەی کردووە کە دەبێ لە پللەی پانزەدا بکرێ ..

تۆزێ حەسایەوە بەڵام خێرا هەستایە پێوەو ویستی بکەوێتە رێی ، کاتێ تفی کرد گوێ لە دەنگێکی سەیر بوو ، ترس گرتی ، دووبارەی کردەوە دیسانەوە گوێی لە هەمان دەنگ بوو ئەمجارە پێش ئەوەی تفەکەی بگاتە سەر ئەرز ..

ئەم زەلامە چاك ئەیزانی کە تف لە پلەی پەنجای ژێر سفردا ئەیبەستێتەوەو دەنگێکی ئەوها دەردەکات ، بەڵام گەر هاتو پێش ئەوەی بگاتە سەر ئەرزو لە هەوادا بەستێتەوەو بێتە
هاتو پێش ئەوەی بگاتە سەر ئەرزو لە هەوادا بەستێتەوەو بێتە
سەهۆڵ مانای ئەوەیە مەسەلەکە لە پەنجا تێپەڕ بووە .

ئەمەی لەلا زۆر گرنگ بوو ، چونکە بۆ خۆی بەرەو ( هندرسون کریك ) ئەچێ بەو مەبەستەی بە هاوڕێیەکانی بگا کە لە پێش ئەمدا بەو شوێنە گەیشتوون .. کابرا کە ئەم رێگای گرتووەتە بەر نیازی ئەوەیە ئەو شارەزاییە پەیدا بکات بۆ

ئەوەی بزانێ ئایا بێ ئەکرێ لە وەرزی بەهاردا بگەڕێتەوەو هەندێ هێززم بیات ..

پاش ئەوەی تاریکی‌دا دێ بە ماوەیەك ، واتە لـە سەعـات شەشی ئێوارەدا ئەبێ بـگاتە ئوردوگاکە ، هاورێیەکانیو ئاگرە بڵێسەدارەکەو خواردنی گەرم چاوەڕێ ئەکەن ، ئێستاکە خواردنی بێ‌یەو خواردنەکـــەش خراوەتە ناو دەسەسرێنکەوەو لـــە ژێر باڵتۆوەکەی‌دا قایم کراوە ، پسکێی بەکـەرە چەورکراو گوشتێکی یەکجار زۆر ..

بە بێ ئەوەی چاوی لە هیچ شوێنەوارێك بێ خۆی‌کرد بەناو دارە (تەنتوبەکانە)دا ، هیچی بەدی نەکرد نە شوێن بێ ئادەمیزادێك‌و نە شوێنە واری عەرەبانەیەك لەو عەرەبانانەی کە بە سەر ســەهۆڵو شەختەدا ئەڕۆن .. ئەمە هیچ کارێکی لێ نەکرد ، چۆنکە ئـەوەی ڕاست بێ لەوە دڵنیا بوو کە بە هۆی ئەو خواردنەی کە پێ‌یەتێ لـە بەستەوە ڕزگاری ئەبێ ، بەڵام ئەوەی کـــارێ تێ‌کردبوو ئـــەم سەرمایە بەلەعنەتەیەو بەتایبەتی کـــاتێ کـــە دەستی بۆ لووتو ڕوومەتی بردو هەستی بەوە کرد کە وەك بەردیان لێهاتووە ..

دوا بەدوای زەلامەکە گەماڵێك ئەڕۆیشت ، گەماڵەکـە وەك گورگ وابووو سەرماش بێ تاقـــەتی کردبوو ، چۆنـــکە بەپێ سروشتی تایبەتی خۆی چاك ئەیزانی کە ئەم کاتە کاتی سەفەر کردن نی‌یەو بەڵام عەقڵی ئادەمیزادەکە توانای ئەوەی نەبوو لـــەو شتە

بـکات و ئاگاداری بـکات .. سەرماکـە تا بڵێ توندو تیژ بوو ، گەماڵەکەش هەرچەندە بە پلەی گەرماو سەرما شارەزا نی یە بـەڵام سرۆشتە تایبەتی یەکەی وای تێگەیاندبوو کە پێویستە ئەم زەلامـە خێرا بڕوات بۆ ئەوەی زوو بە زوو بگاتە ئوردوگاکە ، یاخود هیچ نەبێ بیر لە ئاگر کردنێك بـکاتەوە ، یاخـود پەنا بەرێتـە بەر ئەشکەوتێك بۆ ئەوەی لە بەفرو زریاندا بیانپارێزێ ..

پیاوەکەو سەگەکەی کاتی هەناسەیان ئەدا شتێکی وەك لۆکەی شیکراو لەدەمیان دەهاتە خوارێ و تووکی گەماڵەکەش لـە سـەر سمێڵ و ریشی کابرا هەڵئەواسرایەوە .

کابرا کە توتنەکەی بەدان ئەجوا هەستی بە شەختەکە ئەکرد چەناکەکانی ساردوسر ئەکات و ئەیتەزێنێ و لەکـار ئەیانخات . . ریشە سوورەکەی وەك تابلۆیەکی شووشەی لێهاتبوو .. گـەر بێت و بکەوێتە سەر ئەرز وردو خاش ئەبێتەوە .. کەچی هیچ باکی نەبووو بێ باکانە توتنەکەی ئەجواو تام و لەززەتی ئەم جوانە ئازاری شەختەکەی لە بیر ئەبردەوە .

ویستی هەندێ کوتەڵەدار کۆبکاتەوە .. دەستی بە گـەڕان کرد ، ئەیویست ئاگرێك بکاتەوە .. سەیری سەعاتەکەی کرد کات سەعات دە بوو .. لە ماوەی یەك سەعاتدا تەنیا میلێك بە رویشتن ئەبڕی .. کە برسی یی بوو بە نیازی نان خواردن کەمێ دانیشت .. گەماڵەکەش ئەم جۆرە حەسانەوەیانەش بێ خۆش بوو ، رێـگەکە

هیچ جۆرە شوێنەوارێکی پیادا بەدی نەئەکرا ، ئەمەش ئەوە ئەگەیێنێ کە زیاتر لە مانگێك تیەڕیوەو کەس بیرەدا هـاتو چۆی نەکردووە .. کابرا فەت بیری لای ئەم جۆرە خەیاڵانە نەبوو ، تەنیا ئەوەی لا گرنگ بوو تانەکە بخواتو لە سەعات شەشی ئێوارەدا بە هاوڕێیەکانی بگات ..

پیاوەکە تاكو تەنیا بوو کەسێکی نەبوو دەمەتەقەیەکی لە گەڵدا بکات ، گەر بهاتباو کەسێکیتری لە گەڵدا بووایا ئایا پێیان ئەکرا دەم بکەنەوە ؟ ئیستاکەش دەمی بە بەفر گەماروو دراوەو بە تووتن جاپین خۆی خلاّفاندووە ..

لەناکاو هەستی بە سەرماییەکی وەها کرد کە بە درێژای ژیانیدا هەستی پێ نەکردووە .. هەستاو دەستی بە ڕۆیشتن کردو بەیتا بەیتا هەوڵی ئەدا بەفرەکەی سەر دەمو چاوی بسڕێتەوە ، ئەمەی ئەکرد بە بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ ، جارێ بە دەستی ڕاستو جارێ بە دەستی چەپیو کە تۆزێ بوەستابا بەفرەکە دیسانەوە خەرمانەی ئەداو ئەمیش وای لێ ئەهات هەست بە بێ لووتی بکات .

ئەبوایە وەك ئەوانەی کە ڕۆ بە ڕۆی حاڵەتێکی ئەوها ئەبن بکردباو شتێکی بپێچایە دەمو چاوی ، کەچێ ئەمەی لە بیردا نەبوو .. بۆیە هەستی بە پەشیمانیکرد .. ئیتر قەیدی نییە .. خەفەتی نە خوارد .. ئنجا چی ؟ دەمو چاوێکی بەستراوە چ

زیانێکی هەیە ؟ ئەختێ هەست بە ئازارکردنو پاشان نامێنێ ..

سەرڕای ئەمەش هەستێ بە نەوعە ترسێکی کرد ، سرۆشتێکی سامناك ، رووبارێکی بەستوو ، هەتا ئەرزەکەش بگرە بووەتە مایەی ترس . بۆ چەند جارێ قاچی خلیسکاو بەربووەوە ، ئەیزانی رووبارەکان لەم جۆرە هەرێمانەدا وەك سەهۆلیان لێدێت ، ئەشیزانی کە ئادەمیزاد بە سەر ئەم جۆرە رووبارانەدا بڕوات دوور نیە تووشی ئەو شوێنانە بێ کە سەهۆلەکەی تەنکەو لە ژێر قاچدا ئەشکێو ئەبێتە هۆی فەوتاندنی ئادەمیزاد .. ئەم شوێنانە وەك داو وانەو چالاکترین ئادەمیزاد ئەکەن بە نێچیر .. هەندێ جار قوولایی ئاوەکە نزیکەی مەترێك ئەبێ ، کە سەهۆلەکە ئەشکێت بەفرەکەی ژێری وەدەر ئەکەوێو قاچی ئادەمیزاد تیادا نوقم ئەبێو ئەگاتە ئاوەکەو تووشی مەترسی ئەبێ ..

راجێلکا چۆنکە لە ژێر پێیەوە گوێ لە دەنگێك بوو لە هەورە تریشقە ئەچوو ، ئەوەشی بینی کە چۆن سەهۆلەکە ئەشکێتو قاچی تەڕ ئەبێ .. ناچار بوو بیر لە ئاگرکردنەوەیەك بکاتەوە بۆ ئەوەی قاچی گەرم کات وپێلاوو گۆرەوی یەکانی وشك کاتەوە ، هەستایە سەر پێو دیقەتی لە شوێنەکەداو بەفرەکەی سەر دەمو چاوی سڕییەوە ، کە زانی رێگاکە مەترسیی ئەوهای تێدا نیە هەندێ تووتنی خستە دەمیو دەستی بە رویشتن کرد ..

لە پاش تێپەڕ بوونی دوو سەعاتدا تووشی چەند داوێکی ئاوی

بووەوەو توانی لێیان دەرباز ببێ • بە پەنجە بە گەماڵەکەی گەیاند کـە لـــە رویشتندا پێشی بکەوێ ، مەبەستیشی ئەوە بوو رێگاکەی بۆ ئاقی بکاتەوە ، کەچی گەماڵەکە بــە قسەی نەکرد •• بـــە زۆر ناچاری کرد فەرمانەکەی بەجێبهێنێ •• بەم جۆرە توانی لـە داوە ئاوی یەکاندا خۆی بپارێزێ •• گەماڵەکە لە کاتی رویشتندا کـەوتە ناو یەکێك لەو داوانەو قاچی تەڕ بوون ، بەڵام خێرا بازیداو خۆی گەیاندە بەفرەکەو بە دان قەپی لێ گرت بە مەبەستی ئەوەی خۆی لە بەستنەوە رزگار کات •

سەگەکە بە پێی ئالۆشە حەیوانی یەکەیەوە ئەمـــەی کردو ئەگەر ئەمەی نەکردبا ئاوەکەو بەفرەکە پێکەوە ئەبوون بە شەختە•• زەلامەکە دەستکێشە کـــانی داکەندو دەستی بـــە یارمـــەتی دانی گەماڵەکەی کرد ، بەڵام ئەمە زۆری نەخایاندو پاش یـەك دەقیقە دەستکێشەکانی کردەوە دەستو هەردوو دەستی لەناو باخـــەڵی دا شاردەوە •

لە سەعات دوانزەو نیوی نیوەڕۆدا گـــەیشتە کـــەنداڵی (هندرسۆن)و گەر نەوەستابا دوور نەبوو لە سەعات شەشی ئێوارەدا بـگاتە هاورێیەکانی وەك لە پێشدا بریاری دابوو •

رۆژەکە خۆش بوو ، بەڵام هەتاو لە هەرێمی باشووورداو لـــە وەرزی زستان دوور دەرئەکەوێ وەك هەرێمەکانی تری سەرەوە • قۆبچـــەی کراسو چاکەتەکـەی کردەوەو خواردنەکـەی

دەرهێنا ، ئەم مەسەلەیە لە جارەکـــە دەقەیەکی زیاتر تێەپەڕیو
سەرەڕای ئەمەش هەستی بەوە کرد کە پەنجەکانی سڕ بوونەتەوە ،
بۆیە خێرا خێرا دەستی لە ڕانی خشاندو لە سەر کۆمەڵە دارێـکی
بە بەفر داپۆشراو دانیشت بۆ ئەوەی نانەکەی بخوات .. کوتوبڕ
هەستی بەوە کرد پەنجەکانی بە شێوەیەکی ســـەیر تەزیون .. پێ
نەکرا پسکتەکە بە دەست بگرێ ، بۆ جارێکی‌تر دەستی لــە ڕانی
خشاندەوەو دەستکێشەکەی کردە دەست ، ویستی نانەکەی بخوات،
بەڵام ئای لەم شەختەیە کە ڕێـگەی نانخواردنی لێ گرتووە !

ئەبوایا لە پێش بیر لە نانخواردن کردن ئاگرێکی بکردایەوە
بۆ ئەوەی کەمێك لـــەم شەختـــەیە بتوێتەوە .. لـــە پەژارەیی‌و
ساوایەتی‌دا دەستی بە پێکەنین کردو هەستی کرد کـە پەنجەکانی
ساردو سڕ بونەتەوەو ئازارەکەیان نەماوە .. لـــە خۆیەوە پرسی :
نازانم پەنجەکانی‌پێم تەزی‌ون یاخود گەرمای‌یان پێ گەیشتووە ..
کـــە ویستی لە ناو پێڵاوەکانی‌دا بیانجوڵێنێ ئەوەی پێ نەکرا بزانێ
هێزیان تیادا ماوە یاخود مردوون .. بۆیە وەك شێت‌و هـــار ڕاست
بووەوەو غاری‌داو ئەم‌لاو ئەولای کرد تا وای لێ‌هات هەست بـــە
ئازاریان بکات .. سەرماکە لە حەد بەدەرەو پیاوەکـــەی خـەڵقی
(سولفورکریك ڕاستی فەرموو کاتی باسی سەرمای ئەم هەرێمـــەی
کرد ، بیری کەوتەوە چۆن کاڵتەی پێ کرد کاتی ئەم قسەیەی بۆ
کـــرد . بەڕاستی ئەم سەرمایە تەحەموول ناکرێ .. بۆیە وەك
ئامێرێك هەمیشە لە هات‌و چۆ بوو ، پاشان شخاتەکەی دەرهێنـــاو

ئاگرێکی کردەوەو نانەکەی خوارد •• بەرە بەرەش بەفرەکەی سەر جەستەی ئەتوایەوە •

گەماڵەکە ئەم دیمەنەی پێ خۆش‌بوو بە هێمنی لە ئاگرەکەدا دوورو نزیك راوەستا نە وەك تووکەکەی بسووتێ •

کە لە نان‌خواردن بووەوە پایپەکـەی دەرهێناو دەستی بە دوکەڵ کیشان کردو دەستکێشەکانی لـە دەست کردو سـەرو گوێچکەی‌پێچایەوەو بۆ رۆیشتن خۆی ئامادە کرد • سەگەکە حەزی نەئەکرد لە ئاگرەکە دووربکەنەوە ، کە دەرۆی بەرێوە ئاوڕی لـە ئاگرەکە ئەدایەوە وەك ئەوەی بە زەلامەکە بڵێ : باشتر ئەوەیە بۆ لای ئاگرەکە بکەرێتەوە •• سەکە تێگەیشت کە ئەم زەلامە شێت‌و هارە لە مەسەلەی سەرماو گەرما تێناگات • هەروەها باو باپیرەکانیشی نەیانئەزانی شەختە چۆنەو چی‌یە ، ئەو شەختەو تۆفە کـە پللەی گەرمایی ئەگەیێنێتە سەدو حەوت دەرەجەی ژێر سفر ، کەچی خۆی بەوە ئەزانێ‌و باو باپیرانیشی هەروەها ئەزانن‌و باشیش ئەزانێ کـە ئادەمیزاد لەم حالەتەدا پێویستە نەیێتە دەرەوەو لە ناو ژورەوە بێ‌و تا دونیا خۆش ئەبێ خۆی بپارێزێ ••

ئەوەی پێ بوترێ خۆشەویستی لە نیوان پیاوەکەو سەگەکەیدا نەمابوو ، گەماڵەکە چـاوی تەنیا لـە قەمچی پیاوەکـە بوو کـە تیرباران لەشی پێ ئەکات ، بەم قەمچی‌یە ناچاری ئەکرد لە رۆیشتن نەوەستێ ، بۆیە نەیەویست ئەو مەسەلەیەی تێبگەیێنێ ، باکی ئەوەی

ئەبوو پیاوەکە سەلامەت بێ یان نە ‎.. مەسەلە تەنیا گەڕانەوە بوو بۆ لای ئاگرەکە چۆنکە بەرزەوەندی خۆیی تیدایەتی ، بەڵام کە پیاوەکە قەمچییەکەی بەرز ئەکردەوە ناچار ئەبوو دوای بکەوێ ‎.. زەلامەکە هەندێ تووتی دەرهێناو بۆ ماوەی نیو سەعات بەسەر رووبارە بەستووەکەدا رۆیی بەفر گەماڕووی چەناکەو لووتی دابوو ، داوی ئاوی لەوێدا ئەبوو کەچی کوتوپڕ کەوتە ناو یەکێکیانو تا ئەژنۆ نوقم بوو ‎. تووڕەیی دایگرتو جوێنی بە بەختە رەشەکەیدا ، چۆنکە ئەمە وای لێکرد ماوەی سەعاتێك دواکەویتو ئەبێ ئاگرێك بکاتەوەو پێڵاو قاچەکانی وشك کاتەوە ‎.. هەندێ دارە وشکی کۆکردەوەو ئاگرێکی خۆش کردو خێرا خێرا هێزێم چخچیلەی دەرخوارد ئەدا بۆ ئەوەی بە داگیرساوی بمێنێتەوە ، چۆنکە خاموش بوونی ئاگرەکە لەم سەهۆڵبەندانەدا مەترسییەکی گەورەیە ‎.. کابرا گەر تووشی ئەو داوە نەبووبایەو قاچی تەڕ نەبوایا پێ ئەکرا نزیکەی نیو میلێك بە غاردانو ڕاکردن ببڕێو بەم جۆرە دەمارەکانی بە سووڕانەوەی خوێن گەرم ئەبوونەوە ، ئەمەی بە گشتی لەو پیاوەی کە پار لە (سولفوورکریك)وە هاتبوومەوە ئەیزانی ‎..

هەردوو پێی بە تەواوەتی سڕ ببوونەوەو هەست بە بوونیان نەدەکرد ، بۆ ئەوەی ئاگرێك بکاتەوە ناچار بوو دەستکێشەکەی دانێ ، بە مە پەنجەکانی تەزینو لەکار کەوتن ، کە بەڕێوە دەرویشت خوێن بە ئاسانیو ئاسایی بە ناو دەمارەکانی لەشیدا

ئەڕــەڕا ، بەڵام کە ڕاوەستا   هاتوچوکردنی خوێن کز بووەوە ،
لەوە ئەچوو ئەمیش خەریکی ئەوە بێ خۆی بپارێزێ ، خوێنەکەش
زیندو بوو وەك گەماڵەکە ، هەردوکیان ویستیان خۆیان بپارێزن ،
زەلامەکە بێ ئەکرا لە سەعاتێکدا چوار میل ببڕێ بۆیە خوێن بــە
ئاسانی ئەگەیشتە پێستی ، بەڵام ئیستاکە خوێنەکەی لە شوێنێکی
زۆر قووڵدا خۆی شاردووەتەوەو بەم جــۆرە دەستو پێیەکانی
هەستیان بە نەمــانو فەوتانی خوێنەکەیان کردووەو قاچــی سڕ
بوەتەوەو پەنجەکانی دەستی چۆنکە دەستکێشەکەی داکەند ئەمانیش
بەستویانەتەوەو هێچیان بۆ نەمــاوە وەك جلورەیان لێ بێت ، لودتو
ڕوومەتیشی وەك پارچە دارێکی وشكهەڵاتویان لێ هاتووە .

کابرا هەتا ئەم کاتەش لە ژیاندایەو سەلامەتە ، ئەمەش لــەبەر
ئەوەیە کە ئاگرەکە کرایەوەو ئەمیش بە پێی توانای خۆی هێززەو
چخچیلەی دەرخوارد ئەدات،پێڵاوەکانی داکەندو قاچی گەرم کردەوەو
بەفرە کۆکراوە کەی سەر قاچی سڕی یەوە .. بەم جــۆرە توانی
لــە مردن رزگــاری بێ .. ئامۆژگاری یەکــانی زەلامــەکەی
(سولفورکریك)ی هاتەوە بیرو بێکەنی .. ئەوەشی هاتەوە بیرە کــە
پێی وت : پیاو کە پلەی گەرمایی لە پەنجای ژێر سفر کەمتر بوو
نابێ بە تەنیــا سەفەر بــکات ئیستاکە بێکەسو تەنیایەو بەشێوەیەکی
سەیرو عاجباتی لە مردن رزگاری بووە .. پیاو لەم حاڵەتانەدا ئەبێ
خۆی تێکنەداتو نەژلێو بە ووردی بیر بکاتەوە . هەموو کــەسێك
ئەتوانێ بە تەنیا سەفەر بــکاتو پیــاوە کۆنەکانیش هەموویان وەك

پیاوەکەی (سولفورکریك) بوونەو لە زنە زۆر ترسنوکەکان ئەچن •

کاتی بیری لەم شتانە ئەکردەوە تووشی سەر سوورمانێك بوو ، چۆن بەم کوتەو پری یە ڕوومەتو لووتی بەستیانەوەو چۆن پەنجەکانی پی یان نەئەکرا دارە وشکەکان لە زەوی یەوە هەڵگرن و ئەگەریش پێ یان کراوە خۆ ئەم بە هیچ جۆرێك هەستی پێ یان نەکردووە •• ئارادەیەك ناچار بووەوە بۆیان بڕوانێ و بزانێ ئایا تواناى شت هەڵگرتنیان هەیە یا نەء ••

ئاگرەکە خۆشەو ئەکوژاوەتەوەو ئەمیش بە هۆیەوە ورەی لە بەرزیدایە ••

پێلاوە بەستووەکانی کردەوەو گورەوی یە ئەڵمانی یە ئەستوورەکانی وەك پارچە ئاسنێکیان لێ هاتبوو ، بگرە هەتا قیتانەکانیش وەك بەتی پۆلایین وابوون ••

ویستی بە پەنجە بیانکاتەوە کەچی پێ نەکرا ، چەقۆیەك دەرهێنا •• پێش ئەوەی قیتانەکان ببڕێت ئەرز قڵپشایەوەو ئەگەبەتی یەك ڕۆی دا :

پیاوەکە بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێ تووشی هەڵەیەکی گەورە بووبوو ، چۆنکە نە ئەبوایە لە سێبەرو سایەی داری (تەنوب)دا ئاگر بکرێتەوە وەکو ئەم کردی •• ئەبوایە لە شوێنێکی چۆڵدا ئاگر بکاتەوە ، کەچی ئا لێرەدا بەزمەکەی ئایەوەو مەبەستی ئەوە بوو بە ئاسانی چڵەکانی ببڕێتو دەرخواردی ئاگرەکەیان بدات،

ئەوەی لە بیر نەبوو کە ئەم چلانە هەر یەکـــە بارێـــکی بەفری بەسەریەوەیەو بووتە چلورە ، کـــە چلەکانی ئەبڕی دارەکـــە ئەجولایەوەو ئەبوو بە سەهۆڵ باران بە سەر ئاگرەکەوە •• لـــە ناکاو سەهۆڵەکە بەگشتی روخاو وەك تاڤگەیەکی گـــەورەو بەهێز هاتە سەر ئاگرەکەو کوژاندی‌یەوە ••

رووداوەکە لە حیساباتی ئەم زەلایە بەدەر بوو ، قەت ئەوەی بە خەیاڵدا نەهـــاتبوو ، بۆیە وەك شێتو سەرسامی لێهاتو نەتوت گوێ بۆ بریاری هەڵواسینی ئەگرێ •• بیری لەوە ئەکردەوە ئـــەم ئاگرە پێش ئەم کاتەدا چۆن بلێسەیەکی هەبوو •• دیسانەوە خەیاڵی بۆ ئەو زەلامە کەوتە رێ کە لە(سولفورکریك)دا چاوی پێکەوت ، چۆنکە ئەگەر ئیستاکە هاورێیەکی لە گەڵدا بوایە بێ‌گومـــان بۆ داگیرساندنی ئاگرەکە یارمەتی ئەدا •• ئیستاکە ئەبێ هەوڵەکـــەی دووبارە بـــکاتەوە بەمەرجی خۆی تووشی غەڵەت نەکاتو ئەگـــەر بێتو سەرکەوێ ناچـــار ئەبێ پەنجەیەك لـــە پەنجەکانی پێ‌یدا بدۆرێنێ چۆنـــکە ئیستاکە پەنجەکـــانی بەگشتـــی وەك چلورەیان لێهاتووەو کاتێکی زۆری دەوێ تا ئاگرەکە بکرێتەوە • ئەبێ ئـــەم جارە لە سایەی دارەکەدا ئاگرەکە خۆش نەکات •• ئیتر بە ناچاری لێرەو لەوێ دارە وشکی کۆکردەوە ، بەڵام ئای لە پەنجەکانی کـــە توانای ئەوەیان نی‌یە ئەو دارانە هەڵگرن !

گەماڵەکـــە کپو مـــات ببوو سەیری کابرای ئەکرد • • زۆر نائومێد بوو •• پیاوەکە حەسادەتی پێ برد ، چۆنکە بەهۆی ئەم جلە

سرۆشتی‌یەوە هەست بەم سەرمایە ناکات •• کـــە لـــە هێـــزرم کۆکردنەوە بووەوە دەستی خستە گیرفـــان بۆ ئەوەی شخاتەکـە دەربهێنێ ، گوێ لە خشەخشی بوو بەڵام توانای نەبوو هەست بـە بوونی بـکات ، پەنجەکانی تەزیبوون‌و هەستیان تیـــادا نەمابوو •• چاك ئەیزانی کە لە گیرفانی‌یەتی‌و خشەخش ئەکـات ، بەڵام کـــە ئەیویست بیگرێ پێ نەئەکرا •• کە بیریشی لە قاچەکانی ئەکرد کە هیچیان بۆ نەماوە وەك سەهۆڵیان لێ‌بێت شێت‌و هار ئەبوو ••

دەستکێشەکەی بەهۆی دانەکانی‌یەوە لە دەست داکەندو خێرا خێرا وەك ئەوەی مەشق بکات دەست‌و بازۆی رادەوەشاند بـــەو مەبەستەی خوێن لە ناو دەمارەکانی لەشی‌دا جەرەکەت بکـات •• بەم جۆرە هەستی بە جۆرە ئازارێکی کرد لە پەنجەکانی‌دا ، دەستی خستە گیرفانی‌و شخاتەکەی دەرهێنا •• یەکســـەر پـــەنجـەکانی بەستیانەوە •• کاتی ویستی دەنکە شخاتەیەکی دەربهێنێ شخاتەکەی لێ بەربووەوەو کەوتە سەر ئەرز ، ویستی هەڵیگرێ پـێ نـەکرا

چۆنکە پەنجە مردووەکانی هێزیان تیادا نەمـابوو •• پەنجـــە ولووت رووەمـــەت‌و قاچی بەگشتی سڕبوونەوە کـــەچی ئەوەی لا مەبەست نەبووو تەنیـــا مەبەستی ئەوە بوو شخاتەکە هەڵبگرێ ، بۆ چەند جارێك تەقەلای کرد تا لە دوایی‌دا توانی بە ئەنجام بـکات‌و لە دەمی نزیـکی کردەوە ، کردیە وەو دەنـــکێکی دەرهێنا ، دەنـــکە شخاتەکە لێ بەربووەوە ، توانی بە دان هەڵیگرێ •• خستی‌یە سەر

پانی‌و دایگریساند ، بەڵام لە ناکاو کۆکاو دەنکەکە دیسان بەربووە سەر ئەرزو کوژایەوە ..

پیاوەکەی (سولفور کریك) راستی فەرموو .. چۆنکە کـــە بلەی گەرمایی لە بەنجا تیەر بێ ئەبێ پیاو بە تەنیا سەفەر نەکات .

دەنکە شخانەکان کە حەفتا دەنك بوون ، هەموویانی پێـکەوە بە دەستەوە گرت‌و بەشخانەکەی سوایاند ، ئیتر گریان تیەر بوو ، لە هێزز مەکە نزیکیانی کردەوە ، هەستی بە سووتاندنی گۆشتەکەی کرد ، بەهۆی ئەو ئازارەو ئەو بۆنە تایبەتی‌یەوە بەمەی زانی .. لە ئەنجامدا ئاگرەکەی کردەوەو بەو بەڕی هێزو تواناى چڵ‌و داری تێەگرت ، چۆنکە ئەیزانی کـــە مـــان‌و نەمـــانی بـەم ئاگرەوە بەستراوەتەوە .. هەستی بە گەڕانی خوێنەکەی کردو لێ ئاشـــکرا بوو کـــە ئیستاکە بەناو دەرماوەکانی‌دا ئەسووڕێتەوە .. کابرا لـــەم خۆشی‌یە دابوو کە لەناکاو چڵەدارێـــکی گـــەورە کـــەوتە ســـەر ئاگرەکـــەو کوژاندیەوە .. ویستی فریای کـــەوێ بەڵام هیچی پێ‌نەکرا ، وەك شێت‌و هاری لێ‌هـــات‌و هەستایە پێ‌وەو ســـەیری گەماڵەکەی کرد چۆن بۆ خۆی لە سەر سەهۆڵەکەدا بـــە بێ باکی چۆکی داوەو بە ئارەزووی خۆی جم‌و جۆڵ ئەکات ..

حاڵەتەکـــە وای لێ‌کرد بیر لـــە شتێکی ســـەیرو ناخـــۆش بـکاتەوە .. چیرۆکی ئەو زەلامەی هاتەوە یاد کە چۆن تووشی هەمان کارەسات بوو بووو چـــۆن توانی گیان‌لەبەرێکی بیکوژێ‌و

هەردوو دەستی نوقمی ناو سکی بـکاتو لە مردنو فەوتان خـۆی رزگار بـکات .. کەواتە ئەمیش ئەگەر بتوانێ گەماڵەکە بکوژێو هەردو دەستی نووقمی ناو سکی بـکات پەنجەکانی لە سڕبوونەوە رزگاریان دەبێو ئەو ساکە ئەتوانێ ئاگرە داگیرسێنێ .

ئیتر تەماشای گەماڵە بەسەزمانەکەی کردو پێ ئەیاند کـە بێتە پێشەوە ، شێوەی ئەو داوایە وای لە گەماڵەکەی کرد هەست بە مەترسی بکات ، چۆنـکە تا ئێستاکـە گوێ لـەم شێوە بانگکردنە نەبووە لەم زەلامەدا ، واتـە توانی لـە بنـەڕەتو مـەبەستی ئەم داواکردنە بـکات .

هەڕەشەکەی دووبارە کردەوە بەڵام سەگەکە هەر نەهـاتو بە قسەی کابرای نەکرد .. لە ئەنجامدا پیاوەکە بەو پەڕی هێـزو تاوانای پەلامـاریدا ، سەگـەش وەك شێر ئەڕاندیو لێ دوور کـەوتەوە .

بۆ ئەوەی تۆزێ بحەسێتەوەو هێمن بێ لە سەر ئەرزەکـەدا دانیشتو بە دان دەستکێشەکانی کـردە دەست .. دوای ئـەوە هەستایە سەر پێو تەماشای ئەرزەکەی کرد بەو مەبەستەی کـە دڵنیا بێ لەوەی قاچەکانی تا ئێستاکە ماون یاخود نە، چۆنکە نەئەزانی قاچی ماوە یاخـود مردووە .. وردە وردە هـاتە سەر خـۆیو دەنگەکەی جارانی بۆ گەڕایەوە گەماڵەکەش لێ ئەمین بووەوەو هاتە پێشەوە ، کەچی پیاوەکـە دیسانەوە سـەری لێ شێواو ویستی

هەڕەشەو گوڕەشە کەی دووبارە بکاتەوە ، بەڵام بە چی ئەچێ ؟ ئەوا بە دەست‌تواناى هیچی نی‌یە چۆنکە وەك بلّی لـــە کـــاردا کەوتوون •• بۆیە باوەشی بۆ سەگەکـە کردەوەو بەربووە سەر ئەرزو گیان‌لەبەرەکەش هەولّی ئەدا خۆیی لیّ رزگار کات••سەگە دوای ئەم هەولّو تەقەلایە توانی لیّ دوور کەویتەوە نزیکەی چەند مەترێك •• دوور راوەستاو هەردوو گوێچەکەکانی قوت کردەوەو بۆ مەترسی خۆی ئامادە کرد ••

کابرا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئیتر دەربازبوونی زەحمەتەو بەرەو نەمانو فەوتان ئەڕوات •• هەردو دەستی یەکیان کەوتووەو هەتا سگی گەماڵەکەش بگرە بیّ سوودەو کەڵکی نی‌یە ، چۆنکە ئەم تواناى کوشتنی سەگەکەی نی‌یە ، تەماشای هەردوو دەستی کرد بۆ ئەوەی بزانیّ ئەمانە لە جێگەی خۆیاندا ماون یان نەء ••

زۆری لا سەیر بوو کـــە ئادەمیزاد بـگاتە ئەو حـــاڵەتەی نەتوانیّ شوێن دەستی خۆی بزانیّ •• هەستایە پیّوەو بۆ مـــاوەی پێنج دەقەە مەشقی کردو خـــۆی جولاندەوە ، پاشان هەستی بەوە کرد کە دلّی کەوتە کارو دەستی کرد بە دابەشکردنی خوێن ، بەڵام ئەمـــە زۆریّ نەخایاندو خێرا هاتە سەر حاڵەتەکەی جاران • ئنجا زانی کـــە مردنی نزیـکەو لەوە گەیی کە مەسەلەکە سڕبوونی پەنجەو نەمانی دەستو پیّی نیە ، بەڵکو مەسەلەکە لەم کـــاتەدا مردنەو رزگار بوونی لـــە دەزووی جالجالۆکە باریکترە •• وەك شێت بەسەر بەفرەکەغاری ئەداو هەستی بە مەترسی‌یەکی کرد کـە

به درێژایی ژیانیدا به خۆیەوه نەدیوه ‌‌••دووریش نەبوو ئەگەر بهاتباو له سەر ئەم غاردانو ڕاکردنە بەردەوام بیوایا خوێن بۆ لەشی بگەڕایەوه یاخود پێ بکرایا بەو ئوردوگـایه بگەیشتبا کـه هاوڕێیەکانی چاوەڕێی ئەکەن • بەڵام ئای لـەم شەختەیه زۆرو سەختەدا ؟! ئای لەم چەند میلەی کـه من له ئوردوگاکەدا دوور ئەخاتەوه؟بەڵام هەرچۆنێك بێ ئەبێ واز له هەوڵدانو تاقیکردنەوەدا نەهێنێ •

دەستی به ڕاکردنو غاردان کرد ، زۆری پی سەیره چـۆن ئەتوانێ بـه دەستو پێی سەهۆڵاییەوه غـار بدات ، یاخـود پێیەکانی چۆن ئەتوانن قورسایی لەشی هەڵبگرن ، ئەو قاچانەی که ئازو هێزیان له بەردا بڕاوه !

له پاش ئەو غاردانو ڕاکردنە هەستی هیچی بۆ نەمابوو لـه هۆش بچێ •• راوەستا بۆ ئەوەی پشـویەك بدات دووباره دەستی به ڕاکردن کرد ، ئیتر هەر خەریکی غاردانو پشودانەوه بێت • • ئەمەش وای لێ کرد تۆزێ بێتە سەر خۆیو سنگی گەرم بیێتەوه • کـه دەستی بۆ لووتو ڕوومەتو قاچی برد بینی وەك پارچه مەعده نێکیان لێهاتووه، بۆیه هەستی به مەترسییەکی گەوره کردو واقی وڕمـا ، لای وابوو کـه ئیتر لەشی بەگشتی ڕەق بوەتەوه ، بۆیه غاریداو گەماڵەکەش کەوته دوای ••

له ئەنجامدا بەربووه سەر ئەرز ، هەر چـەندی کرد توانای

راستبوونەوەی نەبوو ، هەرچی ناوی هێزو توانا بێ نەماو گەیشتە ئەو قەناعەتەی کە بێ ناکرێ ڕو بە ڕوی ئەم سەهۆڵبەندانە بوەستێو بەرەو نەمان ئەچێ .. چاوی بڕی‌یە سەگەکەی چۆن کپو ماتو هێمنەو لەسەر خۆیەتی ، بۆیە هەزار تفو لەعنەتی لێ‌کرد پاشان هاواری لێ هەڵساو هەستی بە مەترسی‌یەکی کوشندە کرد ..

بەم هاوار هاوارو قیژە قیژە تۆزێ گەڕایەوە سەر بارەکەی جاران‌و بڕیاری ئەوەی دا کە بەو پەڕی ئازایەتی بەرەو ڕوی مردن بچێ ، پێویستە ئاگای لە کەرامەتی خۆی بێو ترسنۆك نەبێ .. ئیستاکە وەك شێت‌و دێوانەی لێهاتووە، چۆنکە کردەوەکانی بەگشتی لە کردەوەی شێت ئەچن .. وەك تەیریکی سەر براوی لە خوێنا گەوزاو بە سەر بەفرەکەدا ئەسووڕایەوە لێ موحەققق بوو کە لەشی خەریکی بەستەوەیەو مردن چاوەڕێ یەتێ .کەواتە پێویستە بەرامبەر بە مردن ئازا بێو ڕێگەیەکی مەردانە بگرێتە بەر چۆنکە مردنی واش هەیە گەلێ لەم جۆرە مردنە گرانترو سەخترە ..

بیری ئەوەی کردەوە ، چۆن هاوڕێیەکانی بە مردووی ئەیبینن‌و سەیری لاشەکەی ئەکەن وەك بەردی لێهاتووە ، ئنجا وای هاتە بەر چاو کە خۆی لە گەڵیاندایەو بە دوی لاشەی هاوڕێیە ونبووەکەیان ئەگەڕێن‌و پاشان بینیان لە سەر بەفرەکەدا کەوتووە .

ئەمەشی هاتەوە خەیاڵ کە ئیستا کە لەگەڵ هاوڕێیەکانی‌یەتی‌و بۆ لاشە ساردو سڕبووەکەی ئەڕوانێو کە بۆ شارەکەی

ئەگەڕێتەوە بە سەر هاتەکانی بەگشتیٰ بۆ خەڵقەکە ئەگێڕێتـەوە ..
پیاوە شارەزاکەی (سولفورکریك)ی کەوتەوە بیر کـــە ئیستاکـــە
بەرامبەر بە ئاگرێکی خۆشدا دانیشتووەو پایەکەی لە دەمیدایەو
لەو بەڕی خۆشی دایە . بۆیە ڕۆی ئەم پرسیارەی لیٰ ئەکا :

- ئەی کابرای زاناو شارەزا تۆ ڕاستت فەرموو ..

پاشان غەرقی خەونێکی خۆش‌و هێمن بووەوەو چاویشی لـــە
گەماڵەکە بوو چـــۆن بۆی ئەڕوانی .. ڕۆژەکـــە بەرەو کۆتایی
ئەڕۆشت ، گەماڵەکەش هیچ ئاگرێکی نەبینی‌و بە درێژای ژیانی‌دا
کەسی نەبینیوە لە وەزعێکی ئەوهادا درێژبێتەوە بیٰ ئەوەی ئاگرێکی
خۆشکراوی لـــە نزیکی‌دا بیٰ .. لیٰ نزیك بووەوەو بـــە دەوری
سوڕایەوە ، زەلامەکە وەك بەردێکی لیهاتبوو کپ‌و خـــامووش‌و
بیٰ‌دەنگ ببووەوە .. گەماڵەکە تا ئەو کاتەی ئەستێرەکانی ئاسمـــان
وەدەر کەوتن بە دیاری‌دا مایەوە ، مـــە دوایی‌دا ناچـــار بوو بەرەو
ئوردوگاکە کەوتەرێ بەو ئومێـــدەی تووشی کەسێك بیٰ هـــەندێ
خواردن‌و گەرمایی‌ی بداتیٰ ..

●

«کارمن» لە دوو رۆژێکی‌تر بەو لاوە نازیت •• «ماسۆن» کە بە دڵێکی غەمگینەوە سەیری گیان‌لەبەرە بەستەزمانەکەی کردو نفی پارچە بەفرەکەی کرد ئەم قسەیەی وت ، پاشان قەیی لە قاچی سەگەکــە گرتو دەستی بە مزینی سنەهۆڵە بەستووەکەی نیوان پەنجەکانی کرد • «ماسۆن» لە سەر قسەکەی دەوامی کردو وتی :

– من بە درێژای ژیانمدا سەگێکم نەدیوە ئەم ناوە گەورەیەی پێوە بێ •• ئەم جۆرە سەگانە زۆر خۆڕنو هــەر کــە تووشی ئاسانترین گیروگرفت بێن ئەتۆپن •• تۆ ســەگت بینیوە بــە ناوی کاســـار •• یان •• سیواش •• یاخود • • هاســـکی ؟ نەخێــر گەورەم •• بۆ شۆکوم بڕوانە ئەوەت لێ ئاشکرا ئەبێ ••

سەگەکە قسەی بە کابرا بڕی‌و هێزێنی بردە سەرو هیچی بۆ نەمابوو بە دانە تیژەکانی مللی ببــەڕێنێ •• پیاوەکەش ئازایانە لێ دوور کەوتەوەو قەمچی‌یەکەی خستەکار •• ئیتر سەگەکە ناچــار بوو لە سەر بەفرەکەدا خۆی درێژ بکاتەوەو دەست بــە ناڵە ناڵو نووزە نووز بــکات ••

ماسۆن وتی :

— من وتم تەماشای شوکوم بکە ، من ئامادەم گرەوت لە گەڵـــدا بکەم کە ئەتوانێ ماوەی حەفتەیەك یاخود کـــەمتر «کارمن» قووت بدات •

(مالموت کید)یش وتی :

— منیش ئامادەم گرەوت لە گەڵدا بـکەم کـــە ئێمە پێش تەواو بوونی سەفەرەکەمان سەر شکوم ئەخۆین •• دە باشە (رۆث) ئەتۆ دەڵی چی ؟!

ئافرەتە هیندستانی یەکە کە خەریکی قاوە لێنان بوو ، جـارێ تەماشای (مالموت کیـــد)ی ئەکردو هەندێ جـــار بۆ مێردەکەی ئەڕوانیو پاشان سەیری سەگەکان کرد ، بەڵام هیچ جۆرە وڵامێکی نەبوو •• ئەوە مەسەلەیەکی راستو راســـەقینەیەو پێویســت بـــە وڵامدانەوە ناکات ، چۆنکە تا ئێستا ماوەی دوو سەد میل ماوەو ئـەو توشووەی کە پێیانە زۆر کەمە ••

ئافرەتەکەو ئەو دوو زەلامە لە دەوری ئاگرەکەدا دانیشتبوونو خەریـــکی نان خـواردن بوون ، بەڵام چـــۆن نان خواردنێك ! سەگەکانیش چاویان تێ بڕیبوون وەك حەسادەتیان پێ ببەن •

مالموت کید •• وتێ :

— لە ئەمرۆ بە دواوە رەنگە خواردنمان دەست نەکـەوێ •••

ئەبێ ئاگاداری سەگەکان بین چونکە رەویشتو کردەوەیان بەرەو خرابی دەڕوات •

( ماسون ) یش ئاوڕێ لە ( رۆت ) دایەوەو پێ وت :

ـــ خاتو ( روت ) تۆ نابێ نائومێد بی •• بەم زووانە لەم بەزمو رەزمە رزگارمان ئەبێ‌و بەو شێوەیە ئەژین کە حەزی لێ دەکەین‌و ئەوەی‌بمانەوێ وەدەستمان ئەکەوێ •

ئافرەتە هێندی‌یەکە چاوە سوورەکانی بە قسەی ( ماســون )ی مێردی گەش ببوونەوە ، ئـەم قسـە خۆشـانە کە یەکـەم جـارە ئەیانبیسی‌و ئەم شێوە ناسکە کە پیاو لە گەڵ ئافرەتدا بەکاری ئەهێنێ وای لێ ئەکات خۆی لەچاو گیان‌لەبەرەکانی‌تردا باشترو بـەرزتـر ببینـێ •••

مێردەکەی بەردەوام بوو لە سەر قسەکەی‌و وتی :

ـــ بەڵێ •• بەڵێ خاتو ( روت ) •• ئیستاکە پیاوە سپی رەنگەکە ئەبەین‌و بەرەو ( هولت‌وونر ) ئەچین‌و چیاو دۆڵ ئەبڕین •• دوور نی‌یـە دەیان یا بیست یاخود چڵ رۆژمان پێ بچێت تا ئەگەینە ئەو شوێنەی کە ئـەتوانین وەك خەڵـکی‌تردا تیـادا بژین •

کە ئـەم قسـانـەی بـۆ ژنـەکەی ئـەکرد ئاوڕێـکی لـە ( ما لموت کید ) ی دایەوە ، کەچی ( روت ) دایە قاقای پێکەنین کە

توێ لە گفتوگۆیەکەی نیوان مێردەکەی‌و (مالموت کید) دا بوو ..

بە مەبەستی کەوتنەڕێ خۆیان ئامادە کردو سەگەکانیان لە عەرەبانەکاندا قایم کردەوە ، (مالموت کید) یش هانی سەگەکانی‌دا بۆ رویشتن ، سەیر ئەوەیە کە ئەم پیاوە بەهێزو ئازایە بەزەیەکی یەکجار زۆری بە سەگەکان ئەهات‌و دژی ئەوە بوو ئازار بدرێن یاخود لێیان بدرێت‌و کە یەکێکیان تووشی مەترسی‌یەکی ببوایا فرمێسك لە چاویدا ئەهاتە خوارێ .. بە بێدەنگی دەستیان بە رویشتن‌کرد ، رێگاکە ئەوەندە سەخت‌و گران بوو رێگەی قسەکردنی لە خەلقەکەدا بڕیبوو .. چونکە ئەوەی بتوانێ لەم هەریمانەدا هات‌و چۆ بە بێدەنگی بکات زۆر بەختیارە ..

سەفەر کردن لەو هەرێمانە جێگەی مەترسی‌و تەنگ‌و چەڵەمەیە .. هەنگاو بە هەنگاو مایەی مەترسی‌یەو بێ هەتا ئەژنۆ نوقمی بەفر ئەبێ‌و تەنیا هەڵەیەك دوور نی‌یە ئادەمیزاد بەرەو مردن‌و فەوتان ببات . سەرەڕای ئەمەش زریان‌و هەورەتریشقەی سامناك‌و رەشەبای وەها کە ئادەمیزاد ڕائەپێچێ .. گەر بوو بە سایقەو رەشەباکە بێدەنگ بووەوە ئیتر بێدەنگی‌یەکی سپی جیهان بەگشتی دائەپۆشێ‌و ئەمە لە هەموویان بەهێزو خراپترە ، چونکە وا لە ئادەمیزاد ئەکات لە دەنگی هەناسەدانی بترسێ .. لە مردن‌و خواوەندو جیهان بەگشتی بترسێت .

رۆژ لە تەواو بووندا بوو .. (ماسون) پێشەوای کاروانەکە

بوو ، گەیشتنە هەورازێك، سەگەكان نەیانتوانی سەركەون ، ئەو بیان لەبەرە بەدبەختو ماندوو برسی یانە هێزیان لەبەردا نەمابوو ..
(ماسون) هەرچەندی كرد هیچی پێ نەكرا ، چونكە یەكێك لە سەگەكان كەوتو عەرەبانەكە وەرگێڕا ، (ماسون) قامچی یەكەی بەكار هێناو ئەو سەگە بەستەزمانەی تیر باران كرد .
(مالوت كید) ئەیڕاندی :

ـ وز بە .. بەسە (ماسون) .. بەسە .. ئەم سەگە وا خەریكە ئەمرێ ..

كەچی (ماسون) وازی نەهێناو سەگەكەی ـ كە كارمن بوو ـ لە نیوان مردنو ژیاندا هێشتەوە .

(كید) ڕقی هەستاو توڕە بوو .. (رۆث)یش هەوڵیدا ئاشتیان بكاتەوە .. (مالوت)یش تا پێكرا دانی بە خوێندا گرتو بەسەر سەگەكاندا چەمایەوەو هیچی بۆ نەمابوو لە ڕقو توڕەیی‌دا بتەقێتەوە .. كاروان كەوتە ڕێ ، سەگە بریندارەكەش بە شەلە شەل كەوتە دوایان .. گەیشتە دارە سنەوبەرێكی گەورەو كۆن .. لای درەختەكە لایاندا .. (ماسون) لە سایەی درەختەكەدا دانیشتو دەستی بە بتەوكردنی قەیتانی پێڵاوەكانی كرد .. لە ناكاودا چڵێكی گەورەی ئەم درەختە كە بەفرو میزوو گرانی كردبوون كەوتە خوارەوە ، چڵەكە كە بەربووەوە هەورەتریشقەیەكەی وەها دروست كرد (ماسون)ی وە خەبەر

هێناو ترساندی •• ویستی ڕایبکات‌و خۆی دوور بخاتەوە ، بەڵام جڵەکە لەو خێراتر بووو کەوتە سەر سنگی ••

(ماڵوت کید) باکی ئەم ڕووداوانەی نەبوو ، خێــرا فریای (ماسون) کەوت •• سەبریش ئەوەیە کــە (ڕۆث) باوکــە ڕۆی نەکردو نەگریا وەك ئەو ئافرەتانەی کە تووشی کارەساتێکی ئەوها ئەبن • بۆیە فوڕسایی خۆی ـ وەك (کید) پێ وت ـ خستە سەر لایەکەی‌تری جڵەکە بۆ ئەوەی لە سنگی مێردەکەی بەرزبێتەوەو (ماڵوت کید)یش تەورەکەی خستەکار بۆ بڕینی جڵەکــە بــە بێ ئەوەی هیچ زەرەرێك بەو ئادەمیزادە بگەیێنێ کــە کەوتووەتە ژێری‌یەوە •

لە ئەنجامدا (کید) توانی ئەو گیانلەبەرە ڕزگار بکات کــە لە پێش ماوەیەکدا لە ئادەمیزاد نە ئەچوو •• ڕزگاری کردو لــە سەر بەفرەکەدا درێژی کردەوە •

(ماسون) ئەینالاند ، خەفەت‌و غەمبــاریش ڕۆی ژنەکــەی دایۆشیبووەوە •

پللەی گەرمایی شەستی ژێر سفر بووو کەسیش نی‌یە ئەو توانایەی هەبێ بۆ ماوەی چــەند دەقەیەك لــە سەر بەفردا بــە ڕاکیشاوی بمێنێتەوە ••

(کید)و (ڕوث) هەرچی پێستە حەیوانیان هەبوو هێنایانو بۆ

گەرم کردنەوەی (ماسون) بەکاریان هێناو ئاگریان کردەوە لــە ئەنیشتی‌دا ..

(کید) چاك ئەیزانی کە (ماسون) لە حاڵەتێکی یەکجــار خراپ دایەو لــە مردن نزیــکە ، پشتو قاچو دەستی ڕاستی شکاونو ئەندامەکانی لەشی لەکار کەوتوونو بە هــەزار حــاڵ ئەتوانێ وشەیەك بدرکێنێ .. جگە لەوەش هۆشی لە سەر ئەماوەو قسەی هیچ بووچ ئەکات .

شەو بەسەر چوو .. کە بەیانی بووەوە (ماسون) هاتە سەر خۆی‌و چاوی کردەوەو ئاوڕێکی لە (مالموت‌کید)ی دایەوە کــە لە تەنشتیەوە دانیشتبوو پێ وت :

— کید .. ئەرێ ئەو ساڵانەت لەبیرە کە پێکەوە بووین ؟ مــن لــە بیرمــە چۆن (روث) یارمەتی‌مانی داو بوو بە باشترین یارمەتی دەرمان ..

ئاواتەخــواز بووم بتوانم بەرەو وڵاتەکــەم بیبەمو لــەوێدا ژیانێکی خۆش بەسەر ببەین .. (کید) .. تکات لێدەکەم (روث) بۆ لای هۆزەکەی ئەنێریتەوە .. چۆنــکە کارێــکی کوشندەیە ئافرەت رەوانەی قەومو خێشەکەی بکرێتەوە .. بۆ ماوەی چوار ساڵ لە گەڵمدا ژیاوە .. لــە خواردنمان ئەخواردو وەك ئێمــە ئەژیا .. مەیهێڵە بگەڕێتەوە ، مەیهێڵە بۆ جارێــکی‌تر بۆ ئــەو ژیانەی کە ئێستاکە لە بیری چووە بگەڕێتەوە .. وریای بــە ..

بیاریزه •• رەوانەی ولاتە یەکگرتووەکانیبکە •• ئەوەشت لە بیر بێ •• ئەبێ ئاگات لە منداڵە داهاتووەکەی بی •• ئومێدەوارم کوڕ بێ •• ئەو منداڵە پارچەیەکە لە جەرگمو بەشێکە لە جەستەم • • هەولی لە گەڵدا بدە لەم هەرێمە ساماناکەدا نەمێنێ •• گەر هاتو کچیش بوو بێگومان ئەتوانێ لێرەدا بـژی •• ئەوەی هـەمە بیفرۆشە •• نزیکەی پێنج هەزار دۆلار ئەکەنو بە قەدەر ئـەم پارەیە یان زیاتر لە کۆمپانییەکەدا هـەمە •• با کوڕەکەم لـە قوتابخانەیەکی بەرزدا بخوێنێ •• پێش هەموو شتێك ئەبێ نەهێڵی کوڕەکەم بێتە ئەم هەرێمانەدا ، چۆنکە ئەم شوێنانە بۆ پیاوی سپی دەست نادەن ••

(کید) من ئەمرم •• رەنگە چوار شەوی‌ترم پێ نەچێ • • پێویستە ئێوە بکەونەڕێ •• ئەبێ ئەم رێگەیە تەواو بـکەی • • ژنەکەمو کوڕەکەم لە ئەستۆی تۆ دان •• ئەی خودای مەزن لێت ئەپارێمەوە کە منداڵەکـەم کوڕ بێ •• (کیـد) •• دەی • • مەوەستە •• عەرەبانەکە لێخوڕە •• دەست بە رویشتن بـکە •• چۆنکە بە تۆ ناکرێ من چارەسەر کەی •• (مالموت کید) وتی :

ــ رێگەم بدەرێ ماوەی سێ رۆژ لـە گەڵتابم ••• دوور نی‌یە چـاك بێتەوە •

(ماسون) لە وەڵامدا وتی :

ــ نەخێر •• من بەمە رازی نابم ••

ــ تەنیا سێ رۆژو بەس •

— كاكى خۆم •• پێویستە دەست بە رویشتن بكەی ••

كیـــد وتی :

— باشە •• دوور رۆژ ؟

— كید •• پێـم نەونی مەسەلەكـــە پێوەندیی بە زنەكـــەمو منداڵەكەم هەیە ؟•• برۆ ••

— بۆ تەنیا رۆژێك ؟

— نەخێر •• نەخێر •• رازی نابم ••

— تەنیا یەك رۆژ •• من لەم رۆژەدا فریای ئەوە ناكەوم تەنیـا ئاسكێك بگرم •

(ماسون) وتی :

— باشە •• ئەگەر مەسەلەكە یەك رۆژ بێ بە بێ كەمو زیاد •• من مانیعم نی یە • هەروەها تـكات لێ دەكـەم نەمهێڵی بـــە تەنیایی‌و بێكەسی بەرەو ڕۆی مردن بیم •• تەنیا گوللەیەكم لە تفەنگەكەت بەسە بۆ ئەوەی لەم ئازارە رزگارم بێتەوە •• (روث) بانگ بكە ئەمەوێ خواحافیزی لێ بكەمو كوڕەكەمی بێ‌ی‌بسپێرم‌و بێ بڵێم پێویستە لێرەدا نەمێنێ •• دەی برۆ دەی خوات لەگەڵ ••

(مالوت‌كید) ئافرەتەكەی جێ هێشت لە لای مێردەكەی‌دا ، ئافرەتەكەش دەستی بە گریان كردو ئەویش بـە دوی ڕاوكردنا مللی‌نا •• بـــە درێژای رۆژدا هیچی دەستەكەوت‌و لـــە پاش

ماندووبوونێکی زۆردا گەڕایەوە .. کــە لـە ئوردەگاکە نزیك بووەوە گوێ لـــە هـــاوار هــاوارو قیژ قیژی (رۆث)و وەڕینی سەگەکان بوو ، خێرا هاتە لای ئافرەتەکە بینی تەورێـــکی بـــە دەست گرتووەو سەگەکان دوور ئەخاتەوە ، ئەو سەگانەی کـــە پەتو زنجیرە کانیـــان شکاندووەو هێرشیان بردووەتە ســـەر خواردەمەنی یەکە ..

(کید) یارمەتی یەکی چاکیدا ، بەلاّم لە پاش چی ؟ پاش ئەوەی کە توانیبیان بەشێکی زۆری خواردنەکە تالاّن کەن .

کـــە بەیانی بووەوە گیانلەبەرەکان وەك شێتو هـــاریان لێهاتبوو ، ئیتر شەڕە سەگ بوو .. ئەمیش قەمچی یەکەی خستە کارو ئیتر وازیان نەهێنا تا ئـــەو ڕادەیەی کـــە خـــەریك بوو قەمچی یەکە لەکار کەوێ ..

(روث) لە لای مێردەکەیدا دانیشت وگوێ بۆ قسەکانی شل کرد ، (کید)یش خەریکی ئەوە بوو خواردەمەنی یەکە لـــە ژێر درەختە گەورەکەدا بشارێتەوە وەك ئەوەی راوچی یەکان ئەکـــەن لەم هەرێمانەدا بۆ ئەوەی گورگو سەگ نەیخوات ..

کـــە لەمـــە بووەوە بە قەمچی یەکەی سەگەکانی هێمن کردەوەو بە عـــەرەبانەکانەوە بەستیانەوەو ئەشیاکـــانی بار کردو هەرچی پێستە هەبوو بۆ (ماسون)ی بە جێ هێشت ..

(روث) دوا وانەی لـــە مێردەکەی وەرگرت پێش ئەوەی

بمرێ •• به خه‌فه‌تو نائومێدیه وه سه‌بری نه‌کردو بێ نه‌نه‌کرا هیچ بلێ •• چونکه هه‌ر له منالیه‌وه فێری ئه‌وه بو بوو به قسه‌ی پیاو بکاتو وه‌ك دیل وا بێ •• ئافره‌ته‌که له ناو ئه‌م بیروڕایانه گه‌وره بووه‌و هه‌ر به‌م شێوه‌یه ئافره‌ته‌کانی تری بینبوه •• بۆ دوا جار مێرده‌که‌ی ماچ کرد •• پاشان (کید) ده‌ستی گرتو سواری عه‌ره‌بانه‌که‌یی کردو بێ ئه‌وه‌ی ئاگای له خۆی بێ قه‌مچی‌یه‌که‌ی ڕاوه‌شاندو عه‌ره‌بانه که‌وته‌ڕێ ••

(مالوت‌کید)یش بۆ لای (ماسون) گه‌ڕایه‌وه •• (ماسون) له هۆش چووه •• (روث) دوور که‌وته‌وه •• (کید) له لایه‌ن هاوڕێیه‌که‌یدا مایه‌وه چاوه‌ڕوانی ئه‌وه‌ی ئه‌کرد رۆحی بۆ لای خواوه‌ند بگه‌ڕێته‌وه ••

سه‌عاتێكو دوو تێپه‌ر بوون ، پیاوه‌که نه‌مرد ، رۆژ گه‌یشته ناوه راستی ئاسمانو بێده‌نگی تا ئه‌هات زیاتر به‌سه‌ر ئاسماندا زاڵ ئه‌بووه‌وه ••

(مالوت) له هاوڕێیه‌که‌ی نزیك بووه‌وه ، که سه‌یری کرد بینی لاشه‌یه‌کی بێ رۆحه •• (کید) خێرا هه‌ستایه سه‌ر پێو سواری عه‌ره‌بانه‌که‌ی بووه‌وه‌و هاواری له سه‌گه‌کان کرد بۆ ئه‌وه‌ی بتوانێ فریای ئه‌و ئافره‌ته که‌وێ که له پێش ماوه‌یه‌کدا عه‌ره‌بانه‌که‌ی خسته کارو ڕۆی ••

●

## سوپاس

- بۆ کاك فاخر بەدری‌ی ئامۆزام کە بۆ لە چاپدانی ئەم کتێبـــە یارمـــەتیی داوم •

- بۆ (بورهان هەژار)ی هونەرمەند کـــە وێنەی بەرگەکـــەی کێشـــاوە •

- بۆ کرێکارەکانی چاپخانەی الحوادث •

## لەبەرهەمەکانی وەرگێر

### بە عەرەبی

- رذاذ الصدأ ١٩٦٩
- اجنحة الصمت ١٩٦٩
- كلمات من كردستان ١٩٧٠
- رباعيات بابا طاهر ١٩٦٩
- اغنية حب لـ نوروز ١٩٧٩

### بە کوردی

- ئای چەندم خۆش ئەوێ ١٩٧٩

### بەرهەمی ئامادەکراو بۆ چاپ

- هەڵبژاردە لە دابو نەریتی گەلان .
- کوردو کوردستان لە شیعری عەرەبیدا .